بسم الله الرحمن الرحيم



# باسێك لە بارەی
# بینرانی خوای بەرزو مەزن
# لەدنیا و دوا ڕۆژدا



# باسێك لە بارەی بینرانـــی خوای بەرزو مەزن لە دنیا و دوا ڕۆژدا

عـەلی باپیـر


بڵاوکردنەوەی
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

خـەت
نـەوزاد کۆیـی

بـــــەرگ
زەردەشت کاوانی

نۆرە و ساڵی چاپ
یەکەم ١٤٣٧ ك - ٢٠١٦

تـــیراژ
٢٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٧٧٧) ی ساڵی ٢٠١٥ی پێدراوە





**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس

/TafseerOffice

+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

# پێشکەش بێ

بە هەر کەسێك کە هەوڵدەدات خواناسـیی‌و ئیمانەکـەی هێندەی پتـەوو قووڵ بێ، لـە دنیـادا بـەردەوام بـە چـاوی عـەقڵ‌و دڵ، خـوای بـەرزو بـێ وێنـە ببینـێ‌و، بـە جۆرێـك خوا بپەرستێ، وەك تێیـەوە ڕامێنێ.

# پێشەكی

الحَمْدُ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل‌عمـــران ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النســـاء، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب.

أمَّا بَعْدُ: فإِنَّ أَصْدَقَ الحَديث كَلامُ الله وَخَيْرَ الْهَدي هدْيُ مُحَمَّد صلى الله عليه وسلم وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار[1].

---

١) ئەوە پێـی دەگـوترێ: (خطبـة الحاجـة) كـە پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسـلم هـاوەڵانی بـەرێزی فێردەكرد پێش هەر قسەیەكی گرنگ بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییكردن (خِطْبـة)و .. هتـد، وە ئەم وتارە هەركام لە: الترمذي: (١١٠٥)، والنسائي: (١١٠٤)، وابن ماجه: (١٨٩٢) وأحمد: (٣٧٢٠)، وطبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێكی هێناوە.

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست !

ئەم بەرهەمەی بەردەستت بابەتێکی زۆر گرنگو هەستیار دەتوێژێتەوە، کە بریتیە لە : ﴿ بینرانی خوای بەرزو مەزن لە دنیاو دوارۆژدا﴾، کە هەر لە دێر زەمانەوە ئەو بابەتە مشتو مڕێکی زۆری لەسەر بووە، لەنێو زانایانی ئیسلام دا.

شایانی باسیشە ئەم باسە یەکێکە لە باسەکانی سوورەتی (الأنعام) کە بەرگی پێنجەمی: ﴿ تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز﴾ پێك دێنێ، بەڵام بە باشم زانی بەشێوەی بەرهەمێکی سەربەخۆش چاپو بڵاو بکرێتەوە، تاکو ئاسانتر بگاتە دەستی خوێنەرانی خۆشەویست، چونکە هەموو کەس ئەو تەفسیرەی بۆ مەیسەر نابێ.

هیواداریشم ئەم لێکۆڵینەوەیە مایەی زیاتر بەرچاو ڕوونبونەوەی خوێنەران بێ لە بواری خواناسین داو، سەرەنجام هۆکاری زیاتر پتەوبوونو قووڵتربوونەوەی ئیمانیان بێ.

٢٥ محرم ١٤٣٧ ك
٦ تشرینی دووەمی ٢٠١٥ ز
هەولێر

# ڕێ خۆشكردن

بەڕێزان !

لەبارەی بینینی خوای بەرزو بێوێنەوە، لە نێوان زانایان دا مشتومڕو ڕاجیایی زۆر هەبووەو هەیە.

چ لە دنیادا لە لایەن پێغەمبەری خواوە صلی الله علیە وسلم لە شەوی میعراج دا.

وە چ لە قیامەت دا، لە بەهەشت، لەلایەن بڕوادارانەوە.

وە چ لە خەون دا لە دنیادا .

ئنجا ئێمە خوا پشتیوان بێ، لە هەشت (٨) خاڵان دا، ئەو بابەتە دەتوێژینەوە، کە ئەمانە ناوونیشانەکانیانن:

١/ بۆچی لە دنیادا خوا ﷻ نابینین ؟

٢/ پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەبارەی دیتنی خواوە، لە شەوی میعراج دا، چی فەرمووە ؟

٣/ ئایا پێغەمبەری خوا **(موحەممەد)** صلی الله علیە وسلم لە شەوی میعراج دا، خوای بەرزو مەزنی دیوە، یان نا ؟!

٤/ یەکدەنگیی زانایان لەسەر نەبینرانی خوا، بە چاوی سەر، لە دنیادا.

٥/ زانایان یەکدەنگن لەسەر بینینی خوای پەروەردگار، لەڕۆژی دوایی دا.

٦/ بەڵگەکانی سەلماندنی بینینی خوا لە دوارۆژدا، لەلایەن ئەهلی بەهەشتەوە.

٧/ ئەو زانایانەی دیکە کە دەڵێن: خوا ﷻ نابینرێ، بەڵگەیان چییە؟

٨/ ئایا دەگونجێ خوا ﷻ لە خەوندا ببینرێ ؟

# یەکەم

## بۆچی لە دنیادا خوا ﷻ نابیـنیـن ؟

وەڵامـەکەی ئەوەیـە:

کـە خـوا ئێمـەی لەم سەر زەوییە داناوە بۆ تاقیکردنـەوە، ئنجـا ئەگـەر خـوای پـەروەردگارمـان هەمیشـە لەبەرچـاو بووایـە، چـۆن تاقیکردنـەوە دەبـوو؟ بۆیـەش یەکـەمین وەسـفی ئیمانـداران، کـە لـە سـەرەتای سـوورەتی (البقـرة)دا خـوای بـەرز ئیماندارانی پارێزکاری پێ وەسف دەکات، ئەوەیە کە ئیمانیان بە نادیار هەیە، وەك دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ ﴾، بەڵـێ، بـڕواداران، خـوا نادیـار (غیـب)ەو ئیمـانیان پێیـەتی، بەهەشـت نادیـارەو، ئیمانیـان پێیەتـی، دۆزەخ نادیارەو، ئیمانیـان پێیـەتی، قیامـەت نادیـارەو، ئیمانیـان پێیـەتی، فریشـتەکان نادیـارن‌و، ئیمانیان پێیانـە، جـند پەنهـانەو، ئیمانیـان پێیـەتی، وەحـی هـاتن بـۆ پێغـەمبەران پەنهـانەو، ئیمانیـان پێیـەتی، هـەمووی دەگرێتـەوە!

کەواتـە: حیکمـەتی نـەبینراویی خـوا ﷻ لەلایـەن مرۆڤـەوە، وەك لـە کتـێبی: (خـوا ناسیی، ئایین، ئیمان)دا بە تەفصیلێ باسـمکردوە، ئەوەیە کـە خـوا ئینسـانی دانـاوە تاقـیبکـاتەوە، وەك دەفـەرموێ: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۝٢﴾ الـملك، واتە: ئـەو کەسـەی کـە ژیـانو مـەرگـی گێـڕاون، تـاکو تاقیتان بکاتـەوە.

ئنجـا مرۆڤ چۆن تاقی دەکرێتەوە، ئەگەر خـوای پـەروەردگار ببینـێ، فریشـتە ببینـێو، نێـو بەهەشـتو دۆزەخ ببینـێو، هـەموو شـتێك ببینـێ، ئـەو تاقیکـردنەوەیە چـۆن دەبـێ؟

بەڵـێ ئینسـان لەبەرئـەوەی کـە خـوای کـاربەجـێ لەسـەر زەوی دایـنـاوە، کـە تاقیبکـاتەوە، بۆیـە خـۆی لـێ پەنهـان کـردوەو نایبینـێ، وە دەبـێ بـە چـاوی عـەقڵ بیـبینـێ، خـوا ئینسـانی وا دروسـتکردوە، کە چـاوی توانـای ئەوەی نـەبێ، نەك خوا ببینـێ، بەڵـکو زۆر لـە دروسـتکراوەکـانیش ببینـێ، وەك دوایـی باسـی دەکەم، بۆیە ئینسـان ئەوەی لە توانادا نیە، تەحەممولـی بینینـی خـوای بەرزو مـەزن بکـات، بـەڵکو تەحـەممولی بینینـی هـەندێ لـە دروسـتکراوەکانیش ناکـات، ئـەو هەستەوەرانەی کە هـەمانن، خـوای زانـاو توانـا بە زۆریی باسی سێیانیان دەکـات، ئـەوانیش: بیسـتن، بیـنین، عـەقـڵ، وەك دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ۝٣٦﴾ الإسـراء، واتـە: بێگومـان بیسـتنو بینینو عـەقـڵ، هەر کامێك لەوانە لێیان دەپرسـرێتـەوە.

**با تەماشای هێزی بیستنو بینینو عەقڵی خۆمان بکەین:**

١/ **بیستنو گوێ**: زانایان دەڵێن: گوێی ئینسان دەتوانێ لە (٢٠) لەرینەوە (ذبذبة) تاکو (٢٠,٠٠٠) لەرینەوە ببیستێ، واتە: لە (٢٠) کەمتر نابیستێ، وە لە (٢٠,٠٠٠) هەزاریش زیاتر نابیستێ، واتە: دەنگێك لە (٢٠) لەرینەوەی (ذبذبة) کەمتر، یان لە (٢٠,٠٠٠) لەرینەوەی زیاتری هەبێ، نابیسترێ، ئایا حیکمەتی ئەوە چییە؟ تەماشا بکەن! هەر کۆئەندامێك لە جەستەی ئینساندا هەیە (دڵ، سییەکان، گەدەو ڕیخۆڵەکان، مێشك، جگەر، پەنکریاس، گورچیلەکان) هەموویان دەنگیان هەیە، کە ئیش دەکەن، بەڵام ئایا ئێمە دەنگیان دەبیستین؟! نەخێر، چونکە ئەگەر ئەو دەنگانەمان هەموو بیستبایە، ئیسراحەتمان نەدەکرد، بۆچی دەنگیان نابیستین؟ چونکە لە (٢٠) لەرینەوە کەمترن، هەروەها دەنگی زۆر گەورەش، کە لە (٢٠,٠٠٠) لەرینەوە زیاتر بێ، هەر نایبیستین.

٢/ **بینینو چاو**: دیارە زۆر شتی ورد هەیە، کە ئێمە نایبینین بۆ وێنە: گەردیلە ئەوە هیچ، بگرە گەردیش نابینین، {گەردیلە واتە: (ذرة)، گەرد یانی (جزيء)}[1] بەڵکو لەوەش گەورەتر نابینین، ئێمە، نەك خانە (خلية)، بگرە شانە (نسيج)ش نابینین، یانی خانەش کە لە ملیۆنان گەردو گەردیلە پێکدێ، ئەوەش نابینین، بەڵام دەتوانین بە میکرۆسکۆب (گەورەکەر) بیبینین، کەواتە: شتی زۆر ورد نابینین، وە شتی زۆر دووریش نابینین.

---

١) گەرد: (جُزَيء) لە کۆمەڵە گەردیلەیەك پێکهاتوە، وەك چۆن شانە (نسيج) لە چەند خانە (خلية) یەك پێکدێ، بە ئینگلیزی گەرد ـ جُزَيء: {**(Molecul)** مۆلکۆلی پێدەگوترێ.

وه تیشکەکانیش هەندێکیان نابینین، بۆ وێنه: تیشکی ژێـر سـوورو سـەروو وەنەوشـەیی نـابینین، وه هێـزی موگناتیسـیی نـابینین، وه هێـزی کێشـکردن نابینین، وه ڕووح نابینیـن، بگـره ئەو قسانەی من ئێسـتا بۆ ئێـوەیان دەکـەم و دەگەنه گوێی هەمووتان، قسـەکان دەبینین؟ نەخێر، ئنجا ئـەوه هێـزی بیسـتنو، ئــەوەش هێــزی دیــتن، کــه لــه بەرانبــەر دەرككردنــی هەنــدێ لــه دروسـتکراوەکانیشـدا، دەستەپاچـەن، چ جـای خـوا ﷻ !

**٣/ عـەقـڵ:** دیـاره عـەقـڵو هۆشـی مرۆڤیـش، وەك هەسـتەوەرەکان (الحـواس) سـنووردارە، بۆ وێنـه: عـەقڵ ناتوانـێ ئیستیعابی ئەزەلو ئەبەد بکات، (ئەزەل) واتـه: بـێ سـەرەتا، (ئەبـەد) واتـه: بـێ کۆتـا، ناتوانـێ تێیان بگات، نەك هـەر ئەوەنـده بەڵکو عـەقـڵ جاری وایه له شتی دیکـەش تێناگـات کـه لەبەردەستی خۆشیەتی، با وێنەیەکتان بۆ بێنمەوه، که مـن ئـەو وێنەیـەم هـەم لـه کتێبـی: (خـواناسیی، ئایین، ئیمان)و هەم له بەرگی دووەمی کتێبـی: (ئیمانو عـەقیدەی ئیسلامیی)شـدا له باسی بەدیهـێنەرایەتیی خوای پەروەردگـاردا هێناوەتەوه :

دەڵـێن: یەکـەم کـەس کـه یـاری شـەترەنجی بـۆ دروسـت کـرا، پادشـایەکی هیندیی بـوو، خەفـەتی هـەبووه بەهـۆی ئـەوەوه کـه کـوڕێکـی گیـرا بـوو، دەپرسـێ : فەیلەسـووفێك، شـارەزایەك، یـارییەکـم بـۆ دروسـت بکـات، تـاکو خۆمی پێ بخافڵـێنم، ئنجـا ئەو کەسـەی که شەترەنجی دروسـت کـردوه، گـوتی: مـن یارییەکم دروسـت کـردوه ئاواو ئـاوایه، پێشـانی داو بۆی باسـکرد.

- پادشا گوتی: ئەوه یارییەکی زۆر گرنگـه، ئینسـان زۆر بەخۆیـەوه مەشـغووڵ دەکـات، بەڵام پـێم بڵـێ: به چی پاداشـتت بدەمەوه ؟

+ گوتی: هیچم ناوێ، تۆ پادشـای وڵاتیو ئەوه خزمـەتێکـه به جەنابتم کردوه.

- گـوتی: نەخێـر، حەتمـەن دەبێ داوای پاداشـتێك بکـەی.

+ گوتی: ئاخر هیچم ناوێ.

- گوتی: هەر دەبێ داوابکەی.

+ گوتی: ئنجا ئەگەر هەر زۆرم لێدەکەی یەك داوام هەیە.

- گوتی: چییە ؟ "دیارە شەترەنج (٦٤) خانەیە "

+ گوتی: لە خانەی یەکەم دا دەنکە گەنمێکم بۆ دابنێ، لە هی دووەم دا بیکە بە دوو، لە هی سێیەم دا بیکە چوار، لە هی چوارەم دا بیکە بە هەشت، لە هی پێنجەم دا بیکە شازدە، لە هی شەشەم دا بیکە بە (٦٤)، لە هی حەوتەم دا بیکە بە (١٢٨)، ئاوا چەند قات بێتەوە، هەتا (٦٤) خانەکە تەواو دەبێ.

- پادشا گوتی: جا ئەوە چ تەکلیفێکە لە منی دەکەی ؟

+ گوتی: بۆچی ؟

- گوتی: ئەوە هەمووی دەکاتە چەند مستە گەنمێكو ئەو تەکلیفە هیچ نیە.

+ کابرا گوتی: جەنابی پادشا عەمبارەکانت ئەگەر پڕبن لە گەنم، ئنجا ئەوەندە گەنمەیان تێدا نابێ.

- گوتی: چۆن ؟

+ گوتی: ئەوە قەڵەمو کاغەز، حیسابی بکە !! ڕاستە بە ڕواڵەتی عەقڵ کە تەماشای دەکەی، دەڵێی : دەکاتە چەند مستە گەنمێك، بەڵام وەرە تەماشای بکەو حیسابی بکە، هێندە سفر ڕیز دەبن، ئەگەر سەدانو هەزاران تەن گەنم بێنی، بەش ناکات !!

کەواتە: جاری وایە عەقڵ مەسەلەیەکی دێتە پێش، بۆی لە خۆی دا جێ ناکرێتەوە !

وێنەیەكی دیكە: دووریی مانگ لە زەوی یەوە (٣٨٤,٥٥٠) كیلۆمەترە، واتە: تیشك بە چركەیەكو (١/٣)ی چركەیەك دەگاتە ئێمە لە مانگەوە، ئنجا ئایا چ عەقڵێك بڕوا دەكات، ئەگەر بێتو پارچە كاغەزێك بێنی، ئەستووریی (سمك)یەكەی میللیمەترێك بێ، ئەگەر (١٠٠) جار بینووشتێنیەوە، بەڵام هەموو جارێ دووقات بكرێتەوە، یانی جاری یەكەم دەكرێتەوە دوو، جاری دووەم دەكرێتەوە چوار، دوایی دەكرێتە هەشت، ئاوا چەند قات دەبێتەوە، ئەگەر سەد (١٠٠) جار بینووشتێنیەوە، درێژییەكەی بە باری ئەستووریی دا، دەكاتە زیاتر دووریی نێوان زەویو مانگ !

ئنجا هەرچەندە ئەوە شتێكی ڕاستە، وەرە بە وەرەقەو قەڵەم حیسابی بكە، بەڵام عەقڵ تەصەووڕی ئەوە ناكاتو، سەرەتا لە عەقڵ دا جێی نابێتەوە.

كەواتە: لەڕاستییدا هێزی دیتنی ئینسانو، هێزی بیستنی ئینسانو، هێزی عەقڵی ئینسان، هەموویان سنووردارن، چونكە نە گوێ هەموو دەنگێك دەبیستێو، نە چاو هەموو شتێك دەبینێو، نە عەقڵیش دەتوانێ هەموو شتێك لەخۆی دا بحەوێنێتەوەو جێ بكاتەوە: عەقڵ هەتا ئێستاش لە (روح) تێنەگەیشتوەو نەیزانیوە چییە؟!

وە هێزی كێشندە (قوة الجاذبیة)كە خوا ئەو هەموو بوونەی پێ بەستۆتەوە، تێی ناگات.

هێزی موگناتیسیی، تەماشا دەكەی موگناتیسێكت داناوە، هەرچی ماددەی ئاسنە بۆ لای خۆی ڕای دەكێشێ، تۆش هیچ هێزێك نابینی.

كەواتە: حیكمەتی نەبینرانی خوا لەلایەن مرۆڤەوە، لە ژیانی دنیای دا، تاقیكردنەوەیەتی، هۆكارەكەیشی ئەوەیە كە تواناكانی مرۆڤ سنووردارنو، بایی دەرككردنی ڕاستییەكان ناكەن.

# دووەم

# پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم لەبارەی دیتنی خواوە لە شەوی میعراج دا ، چی فەرمووە ؟

لەوبارەوە، چەند فەرموودەیەك هەن، ئێمە دووانیان لێ بە نموونە دێنینەوە:

**فەرموودەی یەکەم** : ﴿عَنْ أَبِي ذرٍّ رضي الله عنه قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم هَلْ رَأَيْتَ رَبَّكَ؟ قَالَ: «نُورٌ أَنَّى أَرَاهُ»﴾[1]، واتە: ئەبو زەڕ خوای لێ ڕازی بێ، دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم پرسی: ئایا پەروەردگاری خۆتت بینی ؟ ئەویش فەرمووی: ڕووناکیی بوو، چۆنی ببینم ؟

1) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢١٤٢٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٤٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٢٨٢) وَقَالَ: حَسَنٌ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٨).

دیاره (نور)، واته: ڕووناكیی، بەڵام بێگومان ڕووناكییەك، كه خوای پەروەردگاری پێ وەسف بكرێ، وەك ئەو ڕووناكییه نیه، كه ئێمه دەیزانین‌و دەیبینین، كه دیاره ڕووناكیی ماددیی، جیایه لەو ڕووناكییەی كه خوای بێوێنەی پێ وەسف دەكرێ، كه بۆخۆی له سووڕەتی (نور)دا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشۡكَوٰةٖ فِيهَا مِصۡبَاحٌۖ ٱلۡمِصۡبَاحُ فِي زُجَاجَةٍۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوۡكَبٞ دُرِّيّٞ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٖ مُّبَٰرَكَةٖ زَيۡتُونَةٖ لَّا شَرۡقِيَّةٖ وَلَا غَرۡبِيَّةٖ يَكَادُ زَيۡتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوۡ لَمۡ تَمۡسَسۡهُ نَارٞۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٖۚ يَهۡدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَيَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَٰلَ لِلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ٣٥﴾، واته: خوا ڕووناكیی ئاسمانەكان‌و زەوییه... هەڵبەته (نور)ێك، كه خوای پێ وەسف دەكرێ، (نور)ێكی تایبەته به خوای بەرزو مەزنەوه، چونكه سیفەتەكانی خوا، وەك خوان، خوای پەروەردگاریش دەربارەی خۆی فەرموویەتی: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١﴾ الشورى، واته: هیچ شتێك وەك وێنەی وی نیه، وه ئەو بیسەری بینەره.

دیاره ئەو بنچینەیەش هەم زاتی‌و، هەم سیفەتەكانیشی دەگرێتەوه.

**فەرموودەی دووەم :** لەوبارەوه: ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ، قَالَ: قُلْتُ لأَبِي ذَرٍّ: لَوْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم لَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: عَنْ أَيِّ شَيْءٍ كُنْتَ تَسْأَلُهُ؟ قَالَ: كُنْتُ أَسْأَلُهُ هَلْ رَأَيْتَ رَبَّكَ؟ قَالَ أَبُو ذَرٍّ: قَدْ سَأَلْتُ، فَقَالَ: «رَأَيْتُ نُوراً»﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٤٦٢)}، واته: عەبدوڵڵای كوڕی

شەقیق (کە یەکێکـە لە زانایـانی تابیعـــین، واتـە: ئـەو جیلـــەی کـە لـە دوای هـــاوەڵانەوە هـــاتوون)، بـە ئـەبو زەڕی خـــوا لــێی ڕازی بـێ، گــوت: ئەگــەر پێغـەمبەری خـوام صلى الله عليه وسلم بینیبـایە، پرسیارم لـێ دەکـرد. ئەبــو زەڕ گـوتی: لەبـارەی چییـەوە لێـت دەپرسی ؟ گـوتی: لەوبــارەوە لـێم دەپرسـی کـە: ئایـا پەروەردگـاری خۆتـت بینیـــوە؟ ئەبو زەڕیش گــوتی: مـن لەوبـــارەوە لێم پرسـی ؟ فەرمـووی: ڕووناکـییم بینـــی.

لە فەرموودەکەی پێشـــێ دا فـەرمووی: {نُـورٌ أَنَّـى أَرَاهُ} خـــوا ڕووناکییـــە، چۆنی ببینم! دیارە مەبەست پێی شەوی میعڕاجە، چونکە هیچ زانایەك لە تـابیعیین باسی ئەوەی نەکردوە، کـە پێغەمبـەر صـلى الله عليـه وسـلم لەسـەر زەوی خـــوای پەروەردگاری بینیبێ، هـەموویـان باسـی شەوی (الإِسْرَاء والـمعراج) شـــەوڕۆیی‌و بەرزبوونەوە، دەکـەن.

ئیمـام نەوەویی لەوبارەوە کە پێغـــەمبەری خـــوا صـلى الله عليـه وسـلم خـــوای پەروەردگاری بە چاوی سەر بینیوە، لە شــەوی شـەوڕۆیی دا، لـە شـەرحی (صـحیح مسلم)دا دوای چەنـد قسـەیەك دەڵێ: (فَالحَاصِـل أَنَّ الـرَّاجحَ عِنْـدَ أَكْثَـر العُلَمَـاء أَنَّ رَسُولَ الله صلى الله عليه وسلم رَأَى رَبّه بعَيْني رَأْسه لَيْلَة الإِسْرَاء)[1]، واتە: کورتەی قسان: ڕای بە هێزتر لەلای زۆربـەی زانایان، ئەوەیە کە پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وسلم لە شەوی میعڕاج دا، بە چاوی سەری پەروەردگاری خۆی بینیوە.

ئنجـا نەوەویی دەڵـێ: ئەم مەسـەلەیە نابـێ هیچ کـەس گومـانی تێیـدا هـەبێ ! بەڵام هەڵبەتـە گومانیشـی تێدا هـەبووەو هەیـە، بەڵام ئەوە ڕای نەوەوییـــە.

١) ج ٣، ص ٥.

# سێیەم

## ڕاجیایی هاوەڵان لەوبارەوە کە :

## ئایا پێغەمبەری خوا (موحەممەد) صلى الله عليه وسلم لە شەوی میعراج دا، خوای بەرزو مەزنی دیوە ، یان نا ؟

دیارە لەنێوان هاوەڵاندا خوا لێیان ڕازی بێ لەوبارەوە ڕاجیایی هەیە، هەندێکیان پێیانوایە کە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد صلى الله عليه وسلم لە شەوی میعراجدا، خوای پەروەردگاری بە چاوی سەر نەبینیوە، کە عائیشە خوای لێ ڕازی بێ دایکی ئیمانداران (الصديقة بنت الصديق) خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، ڕای وایە، بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، ڕای وایە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە شەوی میعراج دا، خوای بەرزو مەزنی بە چاوی سەر بینیوە، با تەماشا بکەین:

١/ دەربارەی ڕای عائیشە خوا لێی ڕازی بێ ئەم دەقە هەیە: {عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ يَا أُمَّتَاهْ! هَلْ رَأَى مُحَمَّدٌ رَبَّهُ؟ فَقَالَتْ: لَقَدْ قَفَّ شَعَرِي مِمَّا قُلْتَ! أَيْنَ أَنْتَ مِنْ ثَلاثٍ، مَنْ حَدَّثَكَهُنَّ فَقَدْ كَذَبَ: مَنْ حَدَّثَكَ أَنَّ مُحَمَّدًا رَأَى رَبَّهُ، فَقَدْ كَذَبَ، ثُمَّ قَرَأَتْ: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ ۖ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾﴾ الأنعام، ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ... ﴿٥١﴾﴾ الشورى، وَمَنْ حَدَّثَكَ أَنَّهُ يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ، فَقَدْ كَذَبَ، ثُمَّ قَرَأَتْ: ﴿وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ﴿٣٤﴾﴾ لقمان، وَمَنْ حَدَّثَكَ أَنَّهُ كَتَمَ ، فَقَدْ كَذَبَ، ثُمَّ قَرَأَتْ: ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ﴿٦٧﴾﴾ المائدة، الآيَةَ وَلَكِنَّهُ رَأَى جِبْرِيلَ عليه السلام فِي صُورَتِهِ مَرَّتَيْنِ}[1]، واتە: (مەسڕووق) {یەکێکە لە زانایانی تابیعین}، دەڵێ: بە عائیشەم گوت: ئەی دایە گیان ! {خێزانەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە دەقی ئایەت دایکی ئیماندارانن وەك خوا جل جلاله فەرموویەتی: ﴿...وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ... ﴿٦﴾﴾ الأحزاب} ئایا موحەممەد پەروەردگاری خۆی بینی؟{مەبەستی شەوی میعراجە}، گوتی: بەهۆی ئەو قسەیەوە کە گوتت، مووەکانم ڕاوەستان، {کوردەواریی خۆمان دەڵێن: مووم گرژبوون، واتە: ئەوەندە شتێکی گەورە بوو}، تۆ لە کوێی لە سێ قسان، هەر کەسێك بیانکات[2]، بەهەڵەدا چووە :

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٥٢٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٨٧)، وأَحْمَد برقم: (٢٤٢٧٣) تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسنادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْط الشَّيْخَين.

٢) هەرچەندە مانای ڕواڵەتیی (كَذَبَ) بریتییە لە (درۆی کرد) بەڵام ئەوان مەبەستیان پێی (أخطأ) {بە هەڵەدا چووە}، بووە.

هەر کەسێك گوتی: موحەممەد پەروەردگاری خۆی بینیوە: درۆ دەکات، {یانی: بە هەڵەدا چووە}دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾، واتە: چاوەکان نایبینین، وە ئەو چاوەکان دەبینێ، وە خوا پەنهانکاری شارەزایە. هەروەها ئەم ئایەتەشی خوێندەوە: ﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآيِ حِجَابٍ ... ﴿٥١﴾ ﴾الشوری ، واتە: هیچ بەشەرێك بۆی نیە خوا بیدوێنێ، مەگەر بە سرووش، یان لە پشت پەردەوە.

پاشان گوتی: وە هەر کەسێك بۆی باسکردی: کە موحەممەد صلى الله عليه وسلم دەزانێ سبەینێ چی ڕوودەدات، درۆی کردوە، دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ﴿٣٤﴾ ﴾لقمان، واتە: وە هیچ کەسێك نازانێ بەیانی چی دەکات.

وە هەر کەسێکیش بۆی باسکردی کە موحەممەد شتێکی شاردۆتەوە (وەك هەندێك لە شیعە دەڵێن) ئەوە درۆی کردوە، دوایی ئەمەی خوێندەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ﴿٦٧﴾ ﴾المائدة، واتە: ئەی پێغەمبەر ! ئەوەی کە لەلایەن پەروەردگارتەوە پێت ڕاگەیەنراوە، ڕایبگەیەنە، {دوایی دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ:} بەڵام جبریلی دووجار لە وێنەی خۆیدا بینی.

جبریل کە هاتوە بۆ لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە زۆریی خۆی بردۆتە سەر شێوەی پیاوێك کە ناوی (دحية الكلبي)

بووە[1]، کە هاوەڵێکی شێوە جوان بووە، بەڵام پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دوو جاران لە شێوەی خۆیدا جبریلی بینیوه، ﴿ صلی الله علیه وسلم رَأَى جِبْرِيلَ لَهُ سِتُّمِائَةِ جَنَاحٍ ، قَدْ سَدَّ الأُفُقَ﴾[2]، واته: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم جبریلی بینی له شێوەی خۆیدا، کە شەش سەد باڵی هەبوو، {قَدْ سَدَّ الأُفُقَ}، واته: ئاسۆی هەموو پڕ کردبوو :

ئەو دوو جارەش ئاوابوون :

أ - جارێك لەسەر زەوی بینی، کە لە ئەشکەوتی (حراء) دەگەڕایەوە، وەك له (صحیح البخاري)و (صحیح مسلم)دا هاتوه[3].

ب – جارێکیش لە ئاسمان بینی.

وەك خوای پەروەردگار دەبارەی جاری دووەم، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿١٥﴾ ﴾النجم، واته: وە بێگومان جارێکی دیکەش (موحەممەد جبریلی) بینی. لەلای سیدرەتولمونتەها، کە بە هەشتی شوێنی حەوانەوەی، لێوە نزیکه.

ئەمە ڕای عائیشەی دایکی بڕواداران بوو کە نکوولیی دەکات، لەوەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ی خوای بەرزو مەزنی لە شەوی میعراج دا بینیبێ.

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٤٢٨٩) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.
٢) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٤٥٧٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٥٠)، وغيرهما.
٣) البخاري: (٤٩٢٦)، وَمسلم : (٣٩٩)، والترمذي : (٣٣٢٥، والنسائي : (١١٦٣١).

٢/ عـەبدوڵـڵای كوڕی عەبباس خوا لـە خۆیو بـابی ڕازی بێ، ڕایـەكی دیكـەی هەیە، پێیـوایـە كە پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم لە شەوی میعراج دا خوای پەروەردگاری بە چاوی سـەر دیوە: ﴿عَنْ عِكْرِمَةَ عَـنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَـالَ: رَأَى مُحَمَّـدٌ رَبَّـهُ، قُلْـتُ: أَلَـيْسَ اللهُ يَقُــولُ: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ﴿١٠٣﴾ ﴾، قَـالَ: وَيْحَـكَ! ذَاكَ إِذَا تَجَلَّـى بِنُـورِهِ الَّـذِي هُـوَ نُـورُهُ، وَقَـالَ: أُرِيَـهُ مَرَّتَيْــنِ، (وفـي لفـظ) إنّمـا ذلـك إذا خـــلا بكيفيـة لـم يقم لـه بصـر﴾[1]، واتــە: عیكرِەمــە دەڵــێ: عـەبدوڵــڵای كــوڕی عــەبباس گــوتی: موحەمــەد پەروەردگــاری خـۆی بینیــوە (یانـی: لە شەوی میعراج)دا، منیش گوتــم: ئــەدی خـــوا نەیفــەرموە: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ﴿١٠٣﴾ ﴾، واتە: چـاوەكان نایبینن، وە ئەو چـاوەكان دەبینــێ ! گـوتی: هـاوار بۆ تـۆ، ئەوە كـاتێـكە كـە خـوا بەو ڕووناكییـە بدرەوشـێتەوە، كـە هــی خۆیـەتی، وە گــوتی: دوو جــاران پیشــانی درا، {وە لــە بێـژەیــەك دا}ئـەوە كاتێـكە كە بە چۆنیـەتییـەك بـێ، چـاو خۆی بۆ ڕاناگرێ.

بە كورتی: لەوبارەوە كە ئایا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پەروەردگاری بە چاوی سـەری لە شـەوی میعراج دا بینیـوە، یان نەیـبینیـوە؟ ڕا جیــایی هەیـەو وەك گوتـمان: دایكمان عائیشە خـوای لـێ ڕازی بـێ، وە ژمـارەیـەكیش لـە زانایـان پشـتگیـرییان لە ڕایەكەی كردوە، ڕای وایـە نەیبینـیوە.

---

١) أَخْرَجَـهُ التِّـرمِذِيُّ برقم: (٣٢٧٩)، وَقَـالَ هَـذَا حَدِيثٌ حَسَــنٌ غَرِيـب مِـنْ هَــذَا الوَجْـه، وَضَـعَّفَهُ الشيخ الألباني.

بەڵام عـەبـدوڵـڵای كوڕی عـەبباس‌و ژمارەیـەكیش لـە زانـایان، كـە یـەكێكیش لەوانە ئیمام نەوەویی یـە، پشـتـگـیـریی ئەویان كـردوەو دەڵـێن: پێغـەمبـەر صلى الله عليه وسلم خـوای پەروەردگـاری بینیـوە !

كــەواتە: ئــەم مەســەلەیــە یەكێكــە لـەو مەسـەلانەی كـە زانـایان تێیـان دا كەوتوونەتە ڕاجیاییەوە، هەرچـەندە نـەوەویی دەڵـێ: زۆربــەی زانایـان ڕایـان وایـە، بـەڵام ئـەوەی بـۆ مــن دەركـەوتوە ئەوەیـە، كـە زۆربـەی زانایـان ڕایـان وایـە كـە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە شەوی میعراجیشــدا خـوای پـەروەردگاری نەبینیوە، هەندێ جار یەكێك لە زانایان ئەو ڕایەی كە بۆخـۆی لەسـەریەتی، دەڵــێ زۆرینەی زانایـان وادەڵێن، بگـرە هەندێكیــان باســی یەكدەنگــیی (إجماع)یشـیان كـردوە، بێئەوەی كە یەكدەنگیـی لەئارادا بـووبـێ !!.

# چوارەم

## یەكدەنگیی زانایان ، لەسەر

## نەبینرانی خوا بە چاوی سەر لە دنیادا :

هەر لە بارەی بینینی خوای تاك‌و پاكەوە، زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوە كە خوا لە دنیادا بە چاوی سەر نابینرێ، واتە: لەسەر زەوی، دیارە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كە شەوڕۆیی پێكراوەو بەرزكراوەتەوە بەرەو ئاسمانەكان، مانای وایە پەیوەندیی بەسەر زەوی‌و دنیاوە نیە، بە پێی ئەو ڕایە كە دەڵێ: خوای بێوێنەی بینیوە، لە عالەمێكی دیكەدا لە سەرووی ئاسمانەكانەوە خوای پەروەردگاری بینیوە، بەڵام هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، كە خوا ﷻ لە دنیادا بە چاوی سەر نابینرێ، هەڵبەتە كەمێكیش دەڵێن: دەبینرێ، بەڵام لەڕاستیی دا ئەوانەی كە ئەوەیان گوتوە، هیچ بەڵگەیەكیان بەدەستەوە نیە، بۆیەش ڕایەكەیان بە هەند وەرناگیرێ‌و حیسابی بۆ ناكری، بۆیەش گوتمان: زانایان هەموویان ڕایان وایە كە خوای پەروەردگار بە چاوی سەر لەم ژیانە دنیاییەدا نابینرێ.

وە زانایان لەوبارەوە چەند بەڵگەیەکیان هێناوەتەوە، کە من چوارم لێ بە نموونە هێناون:

**بەڵگەی یەکەم**: ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾ الأنعام، واتە: چاوەکان خوا نابینن، ئەو چاوەکان دەبینێ.

کە یەکێك لە ماناکانی (إدراك) وەك گوتمان: بینینە، ئەوی دیکەشیان بریتیە لە: دەورەدان.

**بەڵگەی دووەم**: ئەوەیە کە خوا لە سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتی (١٤٣)دا باسی ئەوە دەکات کە مووسا ﷺ دەچێ بۆ ئەو کاتو شوێنو (میقات)ەی خوا بۆی دیاریی کردوە، ئنجا باس دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ ۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِى وَلَٰكِنِ ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ تَرَىٰنِى ۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبْحَٰنَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٤٣﴾ ﴾، واتە: ئنجا کاتێك مووسا ﷺ هات بۆ ئەو ژوانگەیەی کە بۆمان دیاریی کردبوو، وە پەروەردگاری دواندیو گوتی: ئەی پەروەردگارم! پێشانم بدە تەماشات بکەم، خوا فەمووی: هەرگیز ناتوانی بمبینی، (واتە: لەم ژیانە دنیاییەدا) بەڵام تەماشای ئەو چیایە بکە، (چیایەك بوو لەوێ، نزیك بوو، هەندێك دەڵێن: کێوی طوور بووە)، بەڵام

واپێدەچێ وشەی طوور هەر بە مانای چیا بێ) ئەگەر ئەو خۆی لە شوێنی خۆی ڕاگرت (بۆ دەرکەوتنی من)، تۆش دەتوانی ببینی، ئنجا کاتێك پەروەردگاری درەوشایەوە بۆ ئەو چیایە (خۆی پێشاندا) چیایەکە وردوخاش بوو (سووتا)، وە مووساش لە هۆش خۆی چوو، ئنجا کاتێك کە مووسا هاتەوە هۆش خۆی، گوتی: پاکیی بۆ تۆ ! بۆ لای تۆ گەڕامەوە (پەشیمان بوومەوە)، وە من یەکەمینی ئیماندارانم.

کەواتە: دیترانی خوا ﷻ لەم ژیانە دنیایی یەدا، شتێکی گونجاو نیه.

**بەڵگەی سێیەم:** ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: تَلا رَسُول الله صلى الله عليه وسلم هَذِهِ الآيـة: ﴿ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَ ١٤٣ ﴾، فَقَالَ: قَالَ الله تَعَالى: يَا مُوسى! لَنْ تَرَانـي إِنَّـهُ لَـنْ يَرَانِـي حَيٌّ إِلاَّ مَـاتَ وَلاَ يَـابس إِلاَّ تدهـده[1]، وَلاَ رَطْبٌ إِلاَّ تَفَـرَّق، إِنَّمَا يَرَانِـي أَهْـل الجَنَّـة الَّذِينَ لاَ تَمُـوت أَعْينهُـم، وَلا تبلَى أَجْسَادهُم}[2]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَ ﴾، دوایی فەرمووی: خوای زانا فەرمووی: ئەی مووسا ! هیچ زیندوویەك من نابینێ، کە نەمرێ، وە هیچ شتێکی وشك من نابینێ، کە خلۆر نەبێتەوە، وە هیچ شتێکی تەڕ من نابینێ، کە پرژو بڵاو نەبێ، بەڵام بەس دانیشتووانی

١) تَدَهْدَهُ الحَجَرُ: تَدَحرَجَ، وَدَهْدَهَ الحَجَرَ: قَلَبَهُ بَعْضَهُ على بَعْضٍ، المعجم الوسيط، ص: ٢٩٩.
٢) ذكره الحكيم الترمذي في "نوادر الأصول" (ج٢، ص٤٥)، وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً: الدَّيْلَمِيُّ برقم: (٣٢٤٣) بنحوه، وأبو نعيم في "حلية الأولياء" ج١٠، ص٢٣٥،

بەهەشت ئەوانەی کە چاویان نـامرن، وە جەسـتەکانیان نـاڕزن، دەتـوانن مـن ببینـن.

**بەڵگـەی چوارەم:** ئەم فـەرموودەیـە: ﴿عَـنْ أَبِـي مُوسَـى الأشْـعَرِيّ رضي الله عنه، قَالَ: قَامَ فِيـنَا رَسُـولُ اللهِ صلى الله عليـه وسلم بِأَرْبَــعٍ: إِنَّ اللهَ لاَ يَنَـامُ، وَلاَ يَنْبَغِــي لَـهُ أَنْ يَنَــامَ، يَرْفَـعُ الْقِسْطَ وَيَخْفِضُــهُ، وَيُرْفَـعُ إِلَيْـهِ عَمَـلُ النَّهَــارِ بِاللَّيْلِ، وَعَمَلُ اللَّيْلِ بِالنَّهَارِ حجـابُهُ النورُ (وفـي روايـة: حجابـةُ النّـار) لـو كَشَفَهُ، لأَحْـرَقَتْ سُبُحاتُ وَجْهِهِ كـلَّ شـيءٍ أدْرَكَــهُ بَصَـرُهُ﴾[1]، واتـە: ئـەبو مووسای ئەشعەریی خـوا لێی ڕازی بێ، دەڵـێ: ڕۆژێك پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليـه وسـلم لـە نێوماندا هەڵسـا، چـوار وشـەی فـەرموون، (وتارەکـەی فەرمایشـتەکەی بـریتی بـوو لـە چـوار قسـە): خـوا خـەوی لـێ ناکـەوێ، وە شایسـتەش نیـە خـەوی لـێ بکـەوێ، تـەرازوو بـەرز دەکـاتو نـزم دەکـات، {هەڵبەتە (قسط) بە مانای دادگەریی دێ، بەڵام (قسطاس) بـەمانای تـەرازوو دێو، لێرەشـدا کـە دەفـەرموێ: (قِسْـط) بـەرز دەکـاتو نـزم دەکـات، واتـە: کردەوەکان دەکێشێ، وەك بۆ خـوا شـایسـتەیە}، کـردەوەی ڕۆژیـی بـۆ لا بـەرز دەکرێتـەوە، پێش کردەوەی شەوێ، کـردەوەی شەوێشـی بـۆ لا بـەرز دەکرێتـەوە، پێش کردەوەی ڕۆژێ، {واتە: هەر کاتێ بەندەکـان کردەوەیەك دەکـەن، خـوای پەروەردگـار پێـی ئاگادارە، هـی ڕۆژێ، پـێش شـەوێو، هـی شـەویش، پـێش ڕۆژێ، نەك پێی بچێ}، پـەردەی خـوا {کـە خـوای بـێ وێنـە لـە پشـت ئـەو پـەردەوە خـۆی لــە بەنـدەکانی پـەنهان کـردوەو شـاردۆتەوە} بریتیـە لـە

---

١) أَخْرَجَـهُ أَحْمَد برقم: (١٩٦٤٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٧٩)، وَابْـنُ مَاجَـهْ بـرقم: (١٩٥)، وَأَبُـو عَوَانَـة، برقم: (٣٧٩)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٦٦)، وَالطَّبَرَانِيُّ فـي "الأوسط" برقم: (٦٠٢٥).

ڕووناكـیی، (وە لـە گـێـڕراوەیەك دا: پەردەكـەی ئـاگرە)، ئەگـەر ئـەو پەردەیـە لابدات، پڕشـنگەكانی ڕووی (خـوا) هەرچی لە مـەودای دیتـنـی خوادایـە، لـە دروسـتكراوەكانی، دەیسـتووتێنـن .

ڕیوایـەتێكی دیكـەی بەجۆرە هـاتوە: {عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيّ رَضِـيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: ﴿قَامَ فِينَا رَسُولُ اللهِ صلى الله عليـه وسـلم بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ: فَقَـالَ: أَنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ لاَ يَنَامُ، وَلاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَنَامَ، يَخْفِضُ الْقِسْـطَ وَيَرْفَعُـهُ، يُرْفَـعُ إِلَيْـهِ عَمَلُ اللَّيْلِ قَبْلَ عَمَـلِ النَّهَـارِ، وَعَمَلُ النَّهَـارِ قَبْـلَ عَمَـلِ اللَّيْـلِ، حِجَـابُهُ النُّـورُ ﴾" وَفِي رِوَايَةِ النَّارُ" لَوْ كَشَفَهُ لأَحْرَقَـتْ سُبُحَاتُ وَجْهِـهِ مَـا انْتَهَـى إِلَيْـهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ} {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٧٩)، وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (١٩٥)، وَأَحْمَد بـرقم: (١٩٦٤٩)، وَأَبُـو عَوَانَــة برقــم: (٣٧٩)، وَإِبْـنُ حِبَّـانَ بـرقم: (٢٦٦)، وَالطَّبَرَانِيُّ فـي الأوسط بـرقم: (٦٠٢٥)}، واتـە: ئـەبو مووسـای ئەشـعەریی خوا لـێی ڕازی بـێ، دەڵـێ: جارێكـیان پێغـەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم هەڵسا پێنج وشەی پێ فـەرمووین، فـەرمووی: بێگومـان خـوای زاڵــی خـاوەن شـكۆ، نـانوێ، وە شایستەشـی نیـە بنـوێ، {ناگونجـێ بخـەوێ}، تـەرازوو نـزم دەكاتو بەرز دەكات، كردەوەی شەوێی پێشـی ڕۆژێ بـۆلا بـەرز دەكرێتـەوە، وە كـردەوەی ڕۆژێـی پێشـی شـەوێ بـۆلا بـەرز دەكرێتـەوە، (فریشـتەكان كـردەوەی بەندەكـانی پێشـان دەدەن) ئەو پەردەیەی كە خوای پەروەردگاری پەنهـان كردوە لە دروست كراوەكانی نوورە، {وە لە ڕیوایەتێكی دیكەدا فەرموویەتی ئـاگرە}، ئەگەر خوا ئەو پەردەیە لابدات ، پڕشـنگی ڕووی خوا ، هەرچی بینینـی خـوا دەیبینـێ، هەمووی دەسووتێنـێ، {واتە: هـەموو دروستكراوەكـان}.

كەواتە: خوا ڕووی هەیە، بەڵام وەك باقی سیفەتەكانی ئێمـە نازانیـن چۆنـە.

بێگومان ئەمە یەکێکە لە فەرمایشتە سەرسوڕهێنەرەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کە زۆر بەڕوونیی باسی خوای پەروەردگارو درەوشانەوەی ڕووی خوا دەکات، واتە: خوا ﷻ پەردەیەکی لە نێوان خۆیو دروستکراوەکانیدا داناوە، ئەگەر ئەو پەردەیە لابدا، هەرچی دەیبینێ (خواش هەموو دروستکراوەکانی دەبینێ) پڕشنگی ڕووی خوا، دەیسووتێنێ. {یانی: هەموو دروستکراوەکانی دەسووتێنێ}.

کەواتە: ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوە کە ناگونجێ خوا ﷻ لەم سەر زەوی یە ببینرێ، بەڵێ: بەم جەستەیەی ئێمەو، بەم چاوانەی ئێمە تەحەمولی بینینی خوای بێ وێنە ناکرێ، هەر بۆیەش خوا ﷻ بە مووسای فەرموو: ﴿لَن تَرَىٰنِي﴾، هەرگیز من نابینیو ناتوانی بمبینی، کە دواییش دووبارە قسەی لەبارەوە دەکەین، چونکە هەندێکیان ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە خوای بێ هاوەڵ لە قیامەتێش نابینرێ، بەڵام ئێمە هەر بەم ئایەتە ئێمە بەرپەرچیان دەدەینەوە.

# پێنجەم

## زانایان یەك دەنگن ، لەسەر بینینی خوای پەروەردگار له ڕۆژی دوایی :

وەك چۆن زانایان یەك دەنگن لەسەر نەبینرانی خوا له دنیادا، یەك دەنگیشن لەسەر ئەوە كه خوا ﷻ له ڕۆژی دوایی دا، لەلایەن ئیماندارانەوە دەبینرێ:

١) (النووي) له كتێبەكەی خۆی (شرح صحيح مسلم)دا دەڵێ: (وَأَجْمَعُوا أَيْضَاً عَلَى وقُوعِهَا فِي الآخِرَة ، وَأَنَّ الـمُؤْمِنِين يرون الله تَعَالى دُونَ الكَافِرِين وَزَعمت طَائِفَة مِنْ أَهْلِ البِدعِ: المعتَزِلَة وَالخوارِج وَبَعْض المرْجِئَة أن الله تعالى لا يراه أَحَدٌ مِنْ خَلْقِه، وَأنَّ رؤيته مستحِيلَة عَقْلاً، وَهَذا الَّذِي قَالوهُ: خَطَأ صَرِيح وَجَهْلٌ قَبِيح)[1]، واته: زانایان یەك دەنگن لەسەر بینرانی خوا له دوارۆژدا، ئیمانداران خوای بەرز دەبینن، بەڵام كافران نایبینن، وە كۆمەڵێك له بیدعەتچیی یەكان له موعتەزیلەو خەواریجو مورجیئە {لێرەدا باسی شیعەی

1) ج٣، ص١٥.

نەکردوە، کە شیعەش هەر قەناعەتیان وایەو، ئەوانیش هەر ئەهلی بیدعەتن}، دەڵێن: هیچ کەس لە دروستکراوەکانی خوا لە دوارۆژیشدا، خوای بەرز نابینێ، وە بینرانی خوا شتێکی مەحاڵە بە عەقڵ، بەڵام ئەوەی گوتوویانە، هەڵەیەکی ڕوونە، وە نەفامییەکی ناقۆڵایە

٢) (إِبْنُ كَثِير) لە پوختەی تەفسیرەکەی دا، بە ناوی: (المِصْبَاح المُنِير في تهذيب تفسير إبن كثير)دا، دەڵێ: {وَقَوْلُهُ تَعَالى:﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾ فيهِ أَقْوَال للأَئِمّة مِنَ السَّلَفِ: أَحَدُها: لا تُدْرِكُهُ فِي الدُّنيا، وَإِنْ كَانَتِ تَرَاهُ فِي الآخِرَة، كَمَا تَوَاترت به الأَخْبَار عَنْ رَسُول الله صلى الله عليه وسلم مِن غَيْر مَا طَرِيق ثابت في الصحاح والمسانيد والسنن)[1] واتە: فەرمایشتی خوا کە دەفەرموێ: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾ چاوەکان نایبینن، واتە: لە دنیادا نایبینن، هەرچەندە لە دوارۆژدا دەیبینن، وەك لەوبارەوە هەواڵەکان لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە تەواتور بە ئێمە گەیشتوون، لە (صحاح ومسانيد وسنن)دا.

(صحاح والمسانيد والسُّنن) سێ زاراوەی زانایانی فەرموودەناسن، کە بۆ پۆلێن کردنی جۆری دەقەکانی سوننەت، دایانناون.

٣) ئنجا (إبن الحجر العسقلاني)یش لە کتێبەکەی (فتح الباري)دا دەڵێ: (وأدلة السمع طافحة بوقوع ذلك في الآخرة لأهل الإيمان دون غيرهم، ومنع ذلك في الدنيا، الا أنه اختلف في نبينا صلى الله عليه

١) ص ٤٣٨.

وسـلم)[1](بەڵگەی بیستراو (سمعي)ی ئەوەیە کە بڵێی: پێغەمبەر وایفەرمووە، یاخود لە پێش ئەودا خوای پەروەردگار وایفەرمووە)، واتە: بەڵگە بیستراوەکان زۆر زۆرن لەوبارەوە، بۆ ئیسپاتی ئەوە کە خوای زانا لە دوارۆژدا دەبینرێ لەلایەن ئەهلی ئیمانەوە، بەڵام غەیری ئەهلی ئیمان نایبینن، لە دنیادا ڕێ لەوە گیراوە، بەڵام لەبارەی پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم ڕا جیایی هەیە {هەندێکیان گوتوویانە: پێغەمبەری خوا لە شەوی میعراج دا خوای بینیوە، هەندێکیشیان گوتوویانە نەیبینیوە}[2].

---

١) محاسن التأويل، ج ٤، ص ٦٦٤.

٢) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە، بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەستی (ابن حجر).

# شەشەم

## بەڵگەكانی سەلماندنی بینینی خوا

## لە دوارۆژدا لە لایەن ئەهلی بەهەشتەوە :

**ئێمە لەوبارەوە، بەگشتی شەش بەڵگەمان هێناونەوە:**

**بەڵگەی یەكەم:** هەر ئەو ئایەتەی كە پێشتر خوێندمانەوە، ئایەتی ژمارە (١٤٣)ی لە سوورەتی (الأعراف)دا، كە جارێكی دیكەش دەیخوێنینەوە، پێنج بەڵگەی لێ دەردێنین، لەوبارەوە كە خوا ﷻ لە بەهەشتدا، لەلایەن ئیمانداراونەوە، دەبینرێ، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ ۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِى وَلَٰكِنِ ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ تَرَىٰنِى ۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبْحَٰنَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٤٣﴾ ﴾، هەر كام لە: شیعەو موعتەزیلەو خەواریج و مورجیئە، ئەم ئایەتە

بە بەڵگە دێننەوە، لەسەر ئەوە کە لە بەهەشت دا خوای پەروەردگار نابینرێ، بەڵام لەڕاستییدا بە پێچەوانەوەوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە خوای پەنهانکار دەبینرێ، با بزانین چۆنو بۆچی؟ :

١/ خوا دەفەرموێ : کاتێك مووسا هات بۆ ئەو ژوانگەیەی کە بۆمان دانابوو، وە پەروەردگاری قسەی لەگەڵدا کرد، گوتی: ئەی پەروەردگارم ! پێشانم بدە، تەماشات بکەم ؟

دەڵێین: پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەك مووسا ﷺ ناگونجێ نەزانێ: ئایا خوا دەبینرێ، یان نابینرێ؟

کەواتە: دیارە زانیویەتی کە دەگونجێ خوا ببینرێ، بۆیە داوای بینینی دەکات، بەڵام شتێکی ئاساییە مووسا ﷺ داوای شتێك بکات لە دنیادا نەگونجێ، بەڵام لە قیامەتدا بگونجێ، ئەگەرنا هەرگیز ناگونجێ بۆ شتێك بۆ خوا ﷻ مەحاڵ بێ، پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەك مووسا ﷺ داوای بکات، کە لەنێو هەموو پێغەمبەراندا مووسا ﷺ قسەی لەگەڵ خوای بەرزدا کردوە.

کەواتە داواکردنی مووسا ﷺ لە خوای میهرەبان کە خۆی پێشانبداو تەماشای بکات، بەڵگەیە لەسەر ئەوە، کە خوای بەرزو بێهاوتا دەبینرێ، یانی: ئەگەر لە دنیادا ئینسان توانای بینینی خوای نیە، لە بەهەشت دا خوای پەروەردگار دەبینرێ، لە لایەنی ئیماندارانەوە.

٢/ کە خوای بێ وێنە دەفەرموێ: ﴿لَن تَرَىٰنِي﴾، واتە: تۆ من نابینی، موعتەزیلەو شیعەو خەورایجو مورجیئە دەڵێن: (لَنْ: للتأبيد وَالنَّفي)،

یانـی: (لَنْ) بۆ شتێکه کـه وەلابنـرێ بـه یەکجارەکیـی. ئێمـەش دەڵـێیـن: ئەگـەر واش بێ، بۆ دنیـایە، واتە: تۆ لە دنیــادا هـەرگیز مـن نابینــی بـەڵام خــوای زانــاو توانــا نەیفــەرمووە: (لَــنْ أُرَى) نابینـرێــم، فەرموویەتـــی: ﴿لَن تَرَىٰنِي﴾، واتە: ئەی مووســا ! بـەم شــێوەیەتو، بـەو چـاوانەتو، بـەو توانا جەســتەییەی ئێستات، لە دنیــادا نامبینــی، واتــە: نەفـی بینــرانی خــۆی کــردوە لەلایــەن مووســاوە، لــە چــوارچێــوەی ژیـانی دنیــادا، بـەو چـاوانەو، بەو جەسـتەیە، کە تەحەمولـی بینینـی خـوا ناکات.

٣/ کە دەفەرموێ : ﴿وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِي﴾، بـەڵام تەمـاشــای چیـایەکــە بکـە، ئەگـەر لــە شـوێنی خـۆی خـۆی ڕاگرت، ئەوە تۆش مـن دەبینی، دەڵێین: بێگومـان مانـەوەی چیــا لــە شـوێنی خۆی شتێکی گونجـاوەو، ئەگـەر خــوا ﷻ ئـەو چیــایەی بـە جۆرێکی دیکــە خولقـاندبــایە، کــە بتوانــێ خــۆی ڕابگــرێ، دەمایــەوە، کەواتــە: خــوای پەروەردگــار بینرانی خۆی بەسـتۆتەوە بـە مانـــەوەی چیایەکــە لــە شـوێنی خــۆی، مانــەوەی چـیاش لــە شـوێنی خۆیـدا، شــتێکی گونجـاوە، وەك چۆن پەردەیەك کە خـوا خـۆی پێ لە دروسـتکراوەکانی پەنهان کردوە، دەمینێتەوە، کە لـە ڕووناکیی یان ئاگرە، دەشـگونـجا ئەو چیـایەش مـابایەوە، بەڵام دیــارە خوای پەروەردگار نەیویسـتوە لە دنیـادا ببینـرێ، بۆیە وێنەیەکی هێناوەتەوە، بە شــتێك کە تـەحەمولـی دەرکەوتنـی خـوا ناکـات.

٤/ کـــە دەفــەرموێ: ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا﴾، کاتێــك پەروەردگاری بۆ چـیایەك درەوشـایەوە (تَجَلَّـی) واتــە: دەرکـەوت ئاشـکرا بــوو،

ئنجا هەندێك لە زانایان دەڵێن: خوا لـه كـونی دەرزییـەوە خـۆی پێشـانی ئـەو چیایە داوە، وە هەندێ خەڵكی عەوام دەڵـێن: ئەو كلەی كە خـەڵك چاوی پـێ دەڕێژن، ئافرەتان چاوی پێدەڕێژن، لەو چیای (طور)ەوە دێ، كە بە دەركـەوتنی خوای پەروەردگار سـووتاوە، یان بۆتە خۆڵەمێش! بە هەرحاڵ ئەوە بەڵگەیـەكی وای لەسەر نیە، گرنگ ئەوەیە خـوا دەفەرموێ: كاتێـك پـەروەردگاری مووسـا بۆ چیایەكە درەوشـایەوەو دەركەوت ﴿ جَعَلَهُۥ دَكًّا ﴾، وردو خـاش بـوو، ئەمـەش بەڵـگـەیە لەسەر ئەوە كـە خـوا دەبینـرێ، چونكـە چیـایەكە خـوای لــێ دەركـەوت، بۆیە سـووتا وردو خـاش بوو.

كەواتە: دەگونجـێ خـوا دەربكەوێ، بەڵام ئینسان تەحەمـولی نەكات، وەك چـۆن چـیایەكە تەحەمــولی نەكـرد، وە خــوای پەروەردگــاریش بۆیــە بــە مووسای فەرموو: تەماشـای ئەو چیـایە بكـە، ئەگــەر خـــۆی ڕاگرت، تـۆش من دەبینی، واتە: گرفتـەكە ئـەوە نیــە كـە مــن نەبینرێـم، بـەڵكو گرفتەكـە ئەوەیە كـە تەحەمـولــی ناكــەی، بـە بەڵـگـەی ئـەوە كـە ئـەو چیــایە بـەو سەختییو پتـەوییـە، تەحەمـولـی ناكـاتو تەحـەمـولـیشـی نەكـرد.

٥/ كـــە دەفـــەرموێ: ﴿ وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبْحَـٰنَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، دیارە مـووسا ﷺ لە حەژمـەتی ئەوەی كە ئـەو چـیایەی بـینی، وردو خـــاش بــوو، لــە ئــەنجامی تەجــەللاو دەركــەوتنی خــوادا، لــە هـۆش خـۆی چـووو خـۆی پـێ ڕانەگیـرا، ئنجــا هـەنـدێك دەڵـێن ﴿ صَعِقًا ﴾، (صَعِقَ) یانـی (مـات): مرد، بەڵام بە پێی ئەوە كە دەفـەرموێ: ﴿ فَلَمَّآ أَفَاقَ ﴾، دوای ئەوەی هاتەوە هۆش خۆی، مـانای وایـە هـەر لـە هـۆش

خـۆی چووەو نەمردوە ﴿ قَالَ سُبۡحَـٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ ﴾، گوتـــی: پـاكیی بۆ تۆ، من بۆ لای تۆ گەڕامـەوە، واتە: پاكیـی بۆ تۆ من داوای لێبـوردن لــە تۆ دەكەم لەوەدا كە داوایەكم لێكردووی، لـە دنیـادا جێبەجـێ نابـێ، نـەك وەك هەندێك لە ئەهلی بیدعـەت دەڵـێن: مووسا عليه السلام پەشێمان بووەوە لـەوەی داوایـەكی لـە خـوا كـردوە، كـە شـتێكی مەحاڵـە، ئـەویش بینینـی خـوای بـێوێنەیە! نـەخێر، مووسـا عليه السلام داوای شـتێكی لـە خـوا نـەكردوە، كـە مەحـاڵ بـێ لـە دنیـاو قیامـەتدا، بـەڵكو داوای شـتێكی لێكـردوە، كـە لـە دنیـادا ناگونجـێ.

شـایانی باسیشـە وشـەی: (صَعِقَ) هـەر كـام لە مانـای (مـات) مـرد، وە لە خۆی چوو (غُشِـيَ عليـه) دەگەیەنـێ[1].

لـە كۆتـایی دا دەفـەرموێ: ﴿ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، وە مـن یەكـەمین ئیماندارانم كە تۆ ناگونجێ لـە دنیـادا ببینرێـی، ئەمـە بەڵـگەی یەكـەم لەسـەر بینـرانـی خـوا سبحانه وتعالى لە بەهەشـتدا.

**بەڵـگـەی دووەم**: كـە دەفـەرمـوێ: ﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَـٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَـٰرَۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾الأنعام، واتە: چاوەكان خوا نـابینن، وە ئەو چاوەكان دەبینێ، لێـرەدا مەبەسـت لـە: (چاوەكـان نـایبینن) لـە دنیادایـە، چـونكە ئێـرە دنیایـەو خـواش باسـی ئێـرە دەكـات، ئیـدی نەیفـەرمووە: (لَّا

---

١) مـختـار الصَّحاح: ص ٣٢٣.

تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ فِي الدُّنيا وَالآخِرَة) لە دنیاو دوارۆژدا، چاوەکان نایبینن.

ئنجا هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (إِدْرَاك) جیایە لە (رُؤْيَة)و (إِبْصَار)، دەڵێن: (الإِدْرَاك: هُوَ الإِحَاطَة وَمَعْرِفَة الكُنْه، فهو أخص من الرؤية، ولا يلزم من نفي الأَخصِّ، انتفاءُ الأعم)[1]، (إِدْرَاك): بریتیە لە دەورەدانو زانینی حەقیقەتی شت، کە تایبەتترە لە بینین، وە بە هۆی نەفی کردنی شتێکی تایبەتەوە، شتێکی گشتیش نەفی ناکرێ، واتە: کە خوا دەفەرموێ : (لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ)، واتە: چاوەکان دەوری خوا نادەن، بەڵام کە دەوری نادەن، مانای ئەوە نیە کە ناشیبینن.

ئەوە ئەگەر مەبەست پێی بەهەشت بێ، بەڵام لەڕاستییدا (لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ)، مانای ئەوەیە کە لە دنیادا چاوەکان نایبینن.

**بەڵگەی سێیەم:** لەسەر ئەوە کە خوا ﷻ لە بەهەشت دا لە لایەن ئیماندارانەوە دەبینرێ، ئەو دوو ئایەتە موبارەکەن لە سوورەتی (القیامة)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ وُجُوهٌ يَوۡمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا درەوشاوەن. تەماشای پەروەردگاری خۆیان دەکەن، (إبن کثیر) دەڵێ:{﴿ وُجُوهٌ يَوۡمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴾ ناضِرَةٌ: مِنَ النَّضَارة، أَي حَسَنَةٌ بَهِيَّةٌ

١) المصباح المنير، ص٤٣٨ ، و محاسن التأويل: ج٤، ص٦٦٥.

مُشـرِقَةٌ مَسْـرُورَةٌ، ﴿ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾، أَي: تَـرَاهُ عَـيَانـاً }[1]، واتـه: وشـەی (نَاضِرَةٌ) لە (نضَارة)ەوە هاتوە، واتە: جوانن، درەوشاوەن، ڕووخۆشن، دڵخۆشـن، ﴿ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾، یانی: تەماشای پەروەردگاری خۆیان دەكەن بە ئاشكرا.

**بەڵـگـەی چـوارەم:** بەڵـگەیەكی دیكە هەر لە قورئـان دا، ئـەو دوو ئایەتـەی سـوورەتی (الـمطففين)ن، كـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ﴾، واتـه: نەخێـر ئـەوان (واتـه: كافرەكان) لە پەروەردگاريان پـەردە پۆش دەكرێـن (پەردەیەكیان دێتە بەرچـاو، پەروەردگـاريان نابينـن) دوايـی دەخرێنـە نێو كڵپەی ئاگری دۆزەخـەوە.

یانی: بێ بەشكرانیان لە دیداری خـواو لـە بینینـی خـوا، پـێش خرانـە نێـو دۆزەخيـان خراوە، چونكـە كافرەكـان لـەو ڕۆژەدا، ئـەو ئەنـدازە نارەحـەتییـەی بەوە بۆيـان دێتـە پێشـێ، كـە خـوا نابيـنن، بـە خـودی سـزاو ئەشكـەنجـە دانەكـەيـان، هێنـدە نارەحـەت نابـن.

(إبن كثيـر) دەڵـێ: (قَالَ الإِمَام أَبُو عَبْد الله الشـافِعِي: فِـي هَـذِهِ الآيَـة دَلِيـلٌ عَلَى أَنَّ الـمُؤْمِنِينَ يَرَوْنَهُ عَـزَّوَجَـلَّ يَوْمَـئِذٍ)[2]، واتـه: پێشـەوا ئـەبو عەبدوڵـلا شـافیعیی دەڵـێ: لەم ئایەتـەدا بەڵـگە هەیە لەسەر ئەوە كە ئیمانداران، خـوای زاڵو پـایە بەرزيـان لەو ڕۆژەدا دەبینـن، واتە: لە ڕۆژی قیـامەتـدا.

---

١) الـمصباح الـمنيـر، ص١٤٦٠.
٢) الـمصباح الـمنير، ص١٤٩٢.

**بەڵگەی پێنجەم**: هەر لە قورئاندا ئایەتێکی دیکەش هەیە لە سوورەتی (یونس)دا کە خوا عَزَّوَجَلَّ دەفەرموێ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ۖ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ ۚ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٦﴾﴾ واتە: بۆ ئەوانەی چاکەیان کردوە، چاکە هەیە، (واتە: پاداشتی چاکە هەیە)، وە زیادەش، وە دەموچاویان هیچ تلْخیی‌و ڕەشیی‌و زەبوونیی بەسەردا نایەت، ئەوانە خاوەنی بەهەشتن، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

(إبن كثير) دەڵێ: (وَقَدْ رُوِيَ تَفسير "الزيادة" بالنَّظَر إلى وَجْهِ الله الكَرِيم، عَنْ أَبي بَكْر الصّديق، وَحُذَيْفَة بْن اليَمَان، وَعَبْد الله بْنِ عَبَّاسٍ، وَسَعِيد بْنُ المُسَيّب، وَعَبْد الرَّحْمَن بن أَبي لَيْلَى، وَعَبْدُ الرَّحْمَن بْن سَابط، وَمُجَاهِد، وَعِكْرِمَة، وَعَامِر بن سَعْد، وَعَطَاء، وَالضَّحَّاك، وَالحَسَن، وَقَتَادَة، وَالسُّدِيّ، وَمُحَمَّد بن إسْحَاق، وَغَيْرهُم مِنَ السَّلَفَ وَالخَلَف، وَقَدْ وَرَدَتْ فِي ذَلِكَ أَحَادِيثُ كَثيرَة، عَنْ رَسُول الله صلى الله عليه وسلم)[1]، واتە: تەفسیرکردنی وشەی (وزیادة) بەوە کە بریتیە لە تەماشاکردنی ڕووی بەڕێزی خوا، لە ئەبو بەکری صیددیق‌و حوزەیفەی کوڕی یەمان‌و سەعیدی کوڕی موسەییب‌و عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی لەیلاو عەبدوڕەحمانی کوڕی سابیط‌و موجاهیدو عیکرِمەو عامیری کوڕی سەعدو عەطاءو ضەححاك‌و حەسەنی بەسڕایی‌و سوددیی‌و موحەممەدی کوڕی ئیسحاق‌و غەیری ئەوانیش لە زانایانی پێشین‌و پاشین گێڕدراوەتەوە، {کە وشەی (وزیادة)یان بە تەماشاکردنی ڕووی خوای پەروەردگار تەفسیر کردوە، بە تەئکید ئەو هاوەڵە بەڕێزانەش، وە

١) المصباح المنير، ص٦١٠،٦١١.

تابعیینیش، دەبێ له پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم بیستبێ، ئەگەرنا لەخۆوە ئەو وشەیە ئاوا تەفسیر ناکەن}[1]، ئنجا دەڵێ: وە لەوبارەوە کە خوای پەروەردگار دەبینرێ لە بەهەشتدا، فەرموودەی زۆر گێڕدراونەوە لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم لەوانە:

﴿عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى عَنْ صُهَيْبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم تَلا هَذِهِ الآيَةَ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ﴿٢٦﴾﴾ يونس، قَالَ: إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ، وَأَهْلُ النَّارِ النَّارَ، نَادَى مُنَادٍ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ! إِنَّ لَكُمْ عِنْدَ اللهِ مَوْعِداً يُرِيدُ أَنْ يُنْجِزَكُمُوهُ، فَيَقُولُونَ: وَمَا هُوَ؟ أَلَمْ يُثَقِّلْ مَوَازِينَنَا، وَيُبَيِّضْ وُجُوهَنَا، وَيُدْخِلْنَا الْجَنَّةَ، وَيُجِرْنَا مِنْ النَّارِ؟ قَالَ: فَيُكْشَفُ لَهُمْ الْحِجَابُ، فَيَنْظُرُونَ إِلَيْهِ، قَالَ: فَوَاللهِ مَا أَعْطَاهُمْ شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنْ النَّظَرِ إِلَيْهِ وَلا أَقَرَّ لأَعْيُنِهِمْ}[2]، واتە: عەبدورەحمانی کوڕی ئەبی لەیلا دەڵێ: صوهەیب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا، ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ﴿٢٦﴾﴾، (پاشان) فەرمووی: کاتێك خەڵکی بەهەشتی چوونە بەهەشتێو نیشتەجێ بوون، وە خەڵکی ئاگری دۆزەخیش چوونە نێو ئاگرو نیشتەجێ بوون، بانگکەرێك

---

١) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٩٦١) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَقَالَ الشيخ شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْط مُسْلِم، وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً: إِبْنُ مَاجَهْ برقم: (١٨٧)، وَإِبْنُ خُزَيْمَةَ فِي "التوحيد" برقم: (١٨١)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٤٤١)، وَالنَّسَائِيُّ فِي "الكُبرى" برقم: (١١٢٣٤)، وَالبَزَّار برقم: (٢٠٨٧)، وَأَبُو عَوَانَة برقم: (٤١١)، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي "الكبير" برقم: (٧٣١٤)، وَفِي "الأَوْسَط" برقم: (٧٥٦)، وَالشَّاشِي فِي "المسند" برقم: (٩٩١).

بـانگ دەكـاو جـاڕ دەدات، دەڵـێ: ئـەی خەڵــكی بەهەشــت ! لـەلای خــوا گفتێكـتان هەیە، خــوا دەیـەوێ ئـەو گـفتو بەڵێنـەی بـۆ ئێـوە بێـنێتە دی، ئەوانیـش دەڵـێن: ئـەو گفتــە چیــە؟ ئـەدی ئـەوە نیــە (خــوا) تـای تـەرازووی چـاكەكـانی قـورس كردوویــن، (واتـە: زیـاد لـە كردەوەكـانی خۆمـان) وە ڕووی گـەش‌و جوان كردوویـن، وە خسـتووینە بەهەشـت، وە لـە ئـاگری دۆزەخ پەنـای داوین، (خـوا هـەموو بەڵێنـەكانــی جێــبەجێ كـردوون)، پێغەمبـەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: پەردە لادەدرێ، (پەردەیەك كـە خــوا ﷻ خـۆی پـێ لـە دروسـتكراوەكانی پەنهــان كــردوە)، تەمـاشـای (خــوای پەروەردگــار) دەكـەن، فەرمــووی: ســوێند بـە خــوا، خــوا هـیچ شـتێكی پـێ نـــەداون، لەلایــان خۆشـەویستتــر بــێ، وە بــۆ دڵــیان جێــی فەرامۆشــیی زیـاتربــێ، لــە تەماشـاكردنی خـوای بێ وێنـە !

**بەڵـگـەی شەشەم:** ئەم فەرموودەیـەی پێغـەمبەرە صلی الله علیـه وسـلم، كە دەفـەرموێ: ﴿عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنه، قَــالَ: كُــنَّا مَـعَ رَسُـولِ اللهِ صلى الله عليه وسلم جُلُوسَــاً فَنَظَـرَ إِلَــى الْقَمَـرِ لَيْــلَةَ الْبَــدْرِ، لَيْلَــةَ أَرْبَـعَ عَشْــرَةَ فَقَــالَ: إِنَّـكُمْ سَـتَرَوْنَ رَبَّـكُــمْ كَمَا تَـرَوْنَ هَذَا لاَ تُضَــامُونَ[1] فِــي رُؤْيَتِــهِ﴾[2]، عـەبدوڵــڵای كــوڕی جــەریر خــوا لــێی ڕازی بــێ، گــوتی: ئێمـە لەگــەڵ پێغـەمبەری خـوا صلی الله علیـه وسـلم دانیشـتبووین، تەمـاشــای مانگــی

---

١) ضـامهُ ضَـيْماً: مثـل ضـارهُ ضَـيْراً، وزنـاً ومَعْنـىً، المصباح المنيـر، للفيومي، ص ١٩٠.

٢) أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (١٩٢١٣)، وَالبُخَـارِيُّ بـرقم: (٥٥٤)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (١٤٣٢)، وَأَبُـو دَاوُدَ برقــم: (٤٧٢٩)، وَالتِّــرمِذِيُّ بـرقم: (٢٥٥١)، وَابْــنُ مَاجَـهْ بـرقم: (١٧٧)، وَابْــنُ حِبَّــانَ بـرقم: (٧٤٤٢)، وَالبَيْهَقِيُّ فـي "الشـعب الإيـمان" برقم: (٢٨٣٧).

کــرد لــە شــەوی بــەدر، شـــەوی چـــواردەدا، فــەرمووی: بەدڵنیـــایی ئێــوە پەروەردگاری خۆتـان دەبینـــن، وەك چۆن ئـەم (مـانگ)ە دەبیـنن، زیانتـــان پـێ ناگـا بەهـۆی دیتنی خواوە (زیانتان پێ ناگـات، واتـە: هیــچ خــەوش‌و تـەمێك نایـــەتە پـــێش چاوتـــان، یـاخود وەك دنیـــا نیـــە کــە نــەتوانن ببیـنن، تەحەمـمولـی دیتنـی نەکــەن).



# حەوتەم

## ئەو زانایانەی دیکە کە دەڵێن :

## خوا ﷻ نابینرێ بەڵگەیان چییە ؟

بۆئـەوەی لێکـۆڵینەوەکەمان لێکـۆڵینەوەیەکی بابەتییانـە بـێ، بـا بـزانین ئـەو زانـایانەی دیکە کە دەڵـێن : خـوا ﷻ نابینرێ، بەڵگەیان چـییە ؟ دیـارە ئەوانـەی نکوولـیـی لە بینینـی خـوا ﷻ دەکـەن، لە ڕۆژی دواییـدا، بریتـین لـە: (مُعْـتَزِلَة، شِـيعَة، خـوارِج، مُرْجِئَـة)، هەڵبـەتە جگـە لـەوان ئێسـتاش هەنـدێ خەڵـك هەیـە کە ڕەنگـە لـەنێو بازنـەی ئەهلـی سـوننەتیش دابـن، پێـی وایـە کـە خـوای پەروەردگار لە بەهەشـت دا نابینرێ، وە بەپێی ئـەوەی من تەماشای تەفسـیـرەکانم کردوە ـ کە بە پێویسـت نازانم نـاوی هەموویـان بێنـم ـ ئەوانـە چـەند شـتێك بـە بەڵگە دێننـەوە، کـە من سـێ لـەو شـتانەی کـە بـە بەڵگـەیان زانیـون، بـە نـموونـە دێنمـەوە:

**بەڵگەی یەکەمیان**: هەر ئایەتەکەی سوورەتی (الأنعام)ە، کە دەفەرموێ:

﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾

دەڵێن: ئەوەتا خوا دەفەرموێ: چاوەکان نایبینن، ئەو چاوەکان دەبینێ، دیارە ئێمە باسمان کرد، کە ڕای ڕاستو ڕێك ئەوەیە کە مەبەست لە: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴾، واتە: چاوەکان خوا نابینن لە دنیادا، ئیدی خوا نەیفەرمووە: لە غەیری دنیادا نایبینن، ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴾، واتە: ئەو چاوانەی ئێستا لە دنیادا هەن، نایبینن، خوا باسی دنیا دەکات، قیامەت بە جۆرێکی دیکە باس دەکات، وەك لە سوورەتی (القيامة)دا دەفەرموێ: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا درەوشاوەن. تەماشای پەروەردگاری خۆیان دەکەن، ئەوەش باسی قیامەتە، وە دەفەرموێ: ﴿ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ﴿٢٦﴾ ﴾یونس، ئەوە باسی قیامەتییە، وەك بەڵگەکانمان هێنانەوە، بەڵام هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴾، (أي: لا تُحِيط بِهِ الأَبْصَارُ)، واتە: چاوەکان دەوری خوا نادەن لە بەهەشتیّ دا، گوتوویانە ئەوە لێرەدا مەبەست پێی بەهەشتە، بەڵام ئەگەر﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴾مان بە {(لا تُحيط الأبصار) چاوەکان دەوری نادەن} تەفسیر کرد، ئەو کاتە ئایەتەکە لەگەڵ بینرانی خوادا، تێك ناگیرێ.

بەڵام لە ڕاستییدا پێویست بەو تەئویلە ناکات، چونکە خوا باسی دنیا دەکاتو، باسی بەهەشت ناکات لەم ئایەتەدا، کە دەفەرموێ: چاوەکان لە

دنیادا خوا نابینن، خوا چاوەكان دەبینێ، بەڵام وەك گوتم: هەندێكیان ئاوایان گوتوە، بۆ وێنە: خاوەنی تەفسیری (النسفي) كە ناوی (أبو البركات عبدالله بن أحمد)ە، لە تەفسیرەكەی خۆیدا دەڵێ: (وَتَشُبّث الـمُعْتَزِلَة بهَذِهِ الآية لا يستتب، لأن المنفي هُوَ الإِدْرَاك لا الرؤية، والإِدْرَاك هُوَ الوُقُوف عَلَى جَوَانِب المرئي وَحدُوده، وَمَا يستحيل عَلَيْهِ الحُدود والجهَات، يستحيل إِدْرَاكه لا رؤيته، فَنُزِّلَ الإدراكُ من الرؤية منزلة الإحَاطَة مِنَ العِلْم، وَنَفِي الإِحْاطَة الَّتِي تَقْتَضِي الوُقُوف عَلَى الجَوَانِب والحدود، لا يَقْتَضِي نَفِي العِلْم بِهِ، فَهَكَذَا هَذَا)[1]، واتە: پەنابردنی موعتەزیلەكان بەم ئایەتە، بۆیان تەواو نابێ، چونكە ئەوەی لەم ئایەتەدا لابردراوە، بریتییە لە دەوردان (إدراك) نەك بینین، {رؤية} (واتە: خوا دەفەرموێ: چاوەكان دەوری خوا نادەن، نەك نایبینن)، (إدراك)یش بریتییە لەوە كە تۆ دەوری سنوورەكانی شتێك بدەی، بەڵام زاتێك كە سنووری نەبێو لایەكانی نەبن، موستەحیلە كە دەوری بدرێ، بەڵام موستەحیل نیە كە ببینرێ، (إِدْرَاك)یش لە چاو (رؤية)، وەك (إِحَاطَة) وایە لە چاو (عِلْم)، {خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ﴾ طه، زانیاری ئەوان ناتوانێ دەوری خوا بدات، بەڵام نەیفەرمووە: ناتوانن خوا بزانن، فەرموویەتی: ناتوانن بە زانیارییان دەوری خوا بدەن}، وە لابردنی دەوردانێك كە ئەوە دەخوازێ دەوروبەرەكانو سنوورەكانی ئەو شتە بزانرێ، خوازیاری ئەوە نیە كە زانیاریی لەبارەوە نەبێ، بەهەمان شێوەش: ئەگەر بە چاو دەوردانی شتێك، لابرا، مانای وانیە كە بینرانەكەشی، نەفی كراوە.

---

١) تفسير النسفي: ص: ٣٦٦، ط ١، ١٤٢١ هـ، دار المعرفة .

بەڵام با وەك ئینصاف ئەو ڕایەی خاوەنی تەفسیری (المیزان في تفسیر القرآن)، كە ناوی (الطباطبائي)یە كە زانایەكی شیعەیە، وە تەفسیرێكی زۆر موعتەبەرە لەنێو شیعەداو بیست بەرگە، بەرپەرچێكی باشی ئەو قسەیەی نەسەفیی و ئەوانی دیكەش دەداتەوەو دەڵێ: (لَوْ كَانَ المُرَاد بقوله: ﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴾، هو نفي الإحاطة بجميع أقطار الشيء، لم يكن وجه لاختصاصه به تعَالى، فَإن شَيئاً من الأشياء الجسمَانية ولَها سطوح مُخْتَلِفَة الجهات، كَالإِنْسَان والحَيْوَان وَسَائِر الأَجْسَام الأَرْضِية وَالأجرَام السَّمَاوِية، لا يَمس الحس البَاصر مِنْهَا الاّ ما يواجه الشعاع الدائر بَيْنَ البَاصر والمُبْصَرِ)[1] دەڵێ: ئەگەر مەبەست لە:﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴾ دەوردانی چاو بووایە بۆ هەموو سنوورەكان، ئەو كاتە هیچ ڕوویەكی نەبوو كە تایبەت بكرێ بە خوای بەرزەوە، چونكە هەر شتێك لە شتەكان كە شتی جەستەیین، مادام چەند ڕوویەكی هەبن، وەك ئینسان، {پشتی هەیەو، ڕووی هەیەو، تەنیشتی ڕاستی هەیەو، تەنیشتی چەپی هەیەو، سەری هەیەو خواری هەیە}، وە ئاژەڵەكانو باقی شتە مادییەكانی دیكە كە لەسەر زەویین، یاخود جەستە ئاسمانییەكان، هەستی بینین تەنیا ئەو ڕووەیان دەبینێ، كە تیشكی دەكەوێتە سەر، (واتە: ئەوەی كە دەكەوێتە ڕووی بینەرو، ڕووەكانی دیكەی نابینێ)، كەواتە: ﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴾ ئەگەر مەبەست دەوردان (الإِحَاطَة) بێ، ئەوە بەس بۆ خوا ﷻ وانیەو بۆ شتەكانی دیكەش هەر وایە.

---

١) ج ٧، ص٣١٠ .

کەواتـه: تەفسـیـری ڕاست ئەوەیه کـه بڵـێین: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ ﴾، خوا مـەبەستی پێی دنیایه، یانـی: له دنیادا چاوەکان نایبینن، ئەگەرنا ڕایەکـەی دیکه دەڵـێ: (إدراك) واته: دەوردان، (إحَاطَة)، ئەوە (محمـد حسـين الطباطبائي) بەرپەرچێکـی چاکی داوەتـەوەو، ڕەخنەکەیشـی له جێی خۆی دایـه.

وه ئێمـه فەرق به سـوننەو شـیعه ناکـەین لـەوەدا کـه کـێ هـەقی پێکـاوە، بگـره فـەرق به کـافرو مسوڵمانیش ناکەین، له هـەر شـتێکدا کەسـێك هـەقی لـەلابێ، ئێمـه پشـتگیـریی دەکـەین.

**بەڵـگـەی دووەمیان:** ئەوان بەڵـگەیان بـەوە هێناوەتــەوە، کـه خـوا ﷻ بـه

مووسا عليه السلام ی فەرمووە: ﴿ لَن تَرَىٰنِى ﴾، تۆ هـەرگیز مـن نابینـی، بـەڵام ئێمـه پێشتریش باسمان کرد، که لەڕاستیدا ئەو ئایەته ئەگـەر بـه بەڵـگه بهـێنرێتەوە لەسەر بینینی خـوا، که ئێمـه پێنج بەڵـگەمان لـێ دەرهێنـان، شـایسـتـەتره لەوەی به بەڵگه بهێنرێتـەوە، لەسەر نەبینینی خوا، بۆچـی؟

یـەك: چـونکه وەك پێشـتـریش باسـمان کـرد ﴿ لَن تَرَىٰنِى ﴾، واتـه: بـەم حاڵەتەوەو لەم ژیـانەداو، بەو توانایـەتەوە، که ئێسـتا هەتـه، مـن نابینـی، نـەك به ڕەهـایی.

دوو: ئنجـا که دەڵـێن: ﴿ لَن ﴾، بۆ لابردنی ببڕاببڕایـه، (نَفِـي و تَـأييـد)ە، دەڵـێین: ئەگەر واشبێ، مەبەسـت پێـی ژیانی دنیایـه.

سـێ : پاشـان خـوا ﷻ مەرجـدارکردنـی بینـرانی، بـه نـەجووڵانی چیاوە پەیوەست کردوە، که دیاره مەبەست پێی تەحەممول نەکرانی بینرانـی خـوایه،

بۆیەش چیا (جبل) هەڵبژێردرا، وە چونکە چیا زۆر ڕەق و سەختە، کەواتە: دەگونجێ خوای زاناو توانا، توانایەکی وا بدات بە ئینسان کە خۆی پێشان بداو نەشجوولێ و تەحەمولیش بکات، مانای وایە: وەك گوتم: ئەگەر ئەو ئایەتە بکرێتە بەڵگە لەسەر ئەوە کە خوا دەبینرێ، بەهێزترە لەوەی کە بکرێتە بەڵگە لەسەر نەبینرانی.

چوار : دەرکەوتنی خوا بۆ چیا، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە خوا دەبینرێ، بەڵام چیاکە تەحەمولی نەکردو، بەشەرەکەش تەحەمول ناکات، لەم ژیانە دنیاییەدا.

پێنج : فەرمودەکەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کە دەفەرموێ: ﴿حِجَابُهُ النُّورُ لَوْ كَشَفَهُ لأَحْرَقَ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ﴾[1]، دیسان ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر تەحەمول نەکردنی ئینسان بۆ بینینی خوا ﷻ، لە دنیادا، بەڵام حاڵ و حیسابی قیامەت جیاوازە.

**بەڵگەی سێیەمیان :** هەندێ ڕیوایەتی هەڵبەستراو دێننەوە، جا شیعە ڕیوایەتی هەڵبەستراویان زۆر زۆرن، کە وەك دەگوترێ: (هیچ سەرو بنیان نیە)، هەر لەخۆوە دەڵێن: ئیمام (جعفر الصادق) وایگوتوە، فلان ئیمام وایگوتوە، بەڵام سەنەدیان نیە، وەك ئەهلی سوننەت نین، ئێمە دەڵێین: فلان هاوەڵ لە پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم بیست، دوایی تابیعییەك

---

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٧٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٩٥)، وَأَحْمَد برقم: (١٩٦٤٩)، وَأَبُو عَوَانَة برقم: (٣٧٩)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٦٦)، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي "الأوسط" برقم: (٦٠٢٥).

لەو هـاوەڵـەی بیست، دوایی یەکی دیکە لەوی، ئنجـا یـەکی دیکـە لــەوی، تـا دەگـاتە کۆتـا فەرموودەناس، بەڵام ئەوان وا نیـن، هـەر لـەخۆوە دەڵـێن: فــلان ئیمامــە وایگــوتوە، بــۆ وێنــە: ئێســتا تەماشــای ئــەو دەقــە بکـەن کـە (الطباطبائي) خاوەنی (الـميزان) هـێناویەتی، دەڵــێ: (وَفِـي التوحيـد بإسناده عـن إسماعيل بن الفضل، قال: سألت أبا عـبدالله جعفر بن محمد الصـادق عـن الله تبارك وتعالــى: هل يُـرى فـي الــمعاد؟ فقـال: سـبحان الله وتعالــى عــن ذلـك علواً كبيـراً، يا ابـن الفضـل إن الأبصـار لا تــدرك الاّ مالَـهُ لـون وكيفيـة، والله خالق الألوان والكـيفيات)[1]، واتە: لە کتێبـی (توحيد)دا بە زنجیـرەو سـەنەدی خۆی لە ئیســماعیلی کوڕی فەزڵــەوە هێنــاویەتی دەڵــێ: لـە ئـەبو عەبـدوڵڵا جەعفـەری کوڕی موحەممـەدی صـادقم پرسی، دەربارەی خـوای بـەردەوامو بەرزو پـایە بـەرز: ئایا لە قیـامـەتێ دەبینــرێ؟ ئـەویش گـوتی: پاکیــیو بـەرزیی بـۆ خـوا، وە بەرزییەکی زۆر گەورە بۆ خـوا، لەوە کە ببینــرێ، ئەی کـوڕی فــەزڵ ! چــاوەکان تەنیا ئەو شـتانە دەبینن، کە ڕەنگیان هەیەو چۆنییەتیان هەیە، بـەڵام خوا بەدیهـێنەری ڕەنگەکانو چـۆنیەتییـەکانە.

ئێمـەش دەڵـێیـن: ئەگـەر گریـمـان ئەوە ڕاسـتیش بـێ، چاوەکان تـەنیا ئـەو شتانە دەبینن، کە ڕەنگو چۆنیـەتییان هەیـە لـە دنیـادا، خـۆ ئێمـە ناڵـێیــن: خــوای پەروەردگـــار ڕەنگــێکی تایبــەتییو چۆنیەتییـەکـی تایبەتیــی هەیـە! بەڵکو بینرانی خـوا ﷻ لە بەهەشـتدا بەو شـێوەیە کـە خـوا بۆخۆی دەزانــێ، چونکە حـاڵوباڵـی قیــامـەتو بەهەشـــت ڕۆژی دوایــی، زۆر لــە هــی دنیـــا جیـایە.

---

[1] تعمير الـميزان: ج ٧، ص٣١٠، ٣١١.

# هەشتـەم

## ئایا خـوا ﷻ دەگونجێ لە خـەونـدا ببینـرێ ؟

**ئنجـا بێینــه سەر باسی ئــەوه کــه: ئایــا خـوا ﷻ دەگونجــێ لــه خەونــدا ببینــرێ ؟**

کتێبێــك لەوبــارەوە هەیــە بـەناوی: (تعطیــر الأنــام بذکــر مــن رأی ربَّــهُ فِـي الـمَنــام) هی (عـبدالفتـاح بن صـالح القدیش الیـافعي)یه، که چـاپی یەکــەمی لـه سـالّی (٢٠١١)دا کـراوه، واتـــه: {بـۆن خۆشــکردنی خەڵکــی، بــه باســکردنی ئەوانەی که پەروەردگاریان له خــەوندا بینــیوه}، که ئەو کتێبـه باســی زیـاتر لـه حەفتـا (٧٠) کەسێك دەکات له زانایانو پێشـەوایان، که خــوای پەروەردگـــاریان لــه خەونـــدا بینیـــوه، مـنـیش دیـاره زیـاتر ســوودم لــەو کــتێبــه بینیـــوه، بـۆ نووســینی ئەم باســه، که پێـم وایه هەر کەســێك عەودالّــی هــەق بــێو بیــەوێ لەوبارەوە بەرچاو ڕوونو دڵنیـابێ، ئەم باسـه ئەو ئامانجـەی بۆ دێنێتــه دی.

# بینرانی خوا عَزَّ وَجَلَّ لە خەون دا، ڕاستیەکی سەلمێنراوە

ئێمـە سـێ جۆرە بەڵـگـەی گشـتـی لەوبارەوە دەخەینـەڕوو، کە هـەر کـام لـەو سـێ بەڵـگەیـە، چەنـدان بەڵگـە دەگرێتـە خـۆی :

١/ چـەند فەرموودەیـەك لەبارەی بینینـی خـواوە، لە خـەون دا.

٢/ یەکدەنگیـی (إجـماع)ی زانایانی موعتەبەر لەسـەر دیتنـی خـوا، لە خەون دا.

٣/ ناوی ژمارەیەك لە زاناو پێشـەوایان ـ وەك نـموونە ـ کە خـوای بەرزو مەزنیـان لە خـەون دا، دیـوە.

## ١/ چەند فەرموودەیەك لەبارەی بینینی خواوە، لە خەونـدا:

**یەكەم:** ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا عَنِ النَّبِي صلى الله عليه وسلم قَالَ: أَتَانِي رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَبِّي وَسَعْدَيْكَ، قَالَ: هَلْ تَدْرِي فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قَالَ: قُلْتُ: رَبِّي لاَ أَدْرِي، قَالَ: فَوضَعَ يَدَهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ، فَوَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْن ثَدْيَيَّ، فَعَلِمْتُ مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِب، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! فَقُلْتُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، قَالَ: هَلْ تَدْرِي فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قَالَ: قُلْتُ: فِي الدَّرَجَاتِ وَالْكَفَّارَاتِ، وَفِي نَقْلُ الأَقْدَامِ إِلَى الْجماعَاتِ، وإِسْبَاغُ الْوُضُوءِ فِي الْمَكْرُوهَاتِ، وَانْتِظَارُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصَّلاَةِ، وَمَنْ يحافظ عَلَيْهِنَّ عَاشَ بِخَيْرٍ، ومات بخير، وكَانَ مِنْ ذُنُوبِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ﴾[1]، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: پەروەردگارم لە جوانترین شێوەدا هاتە لام (لە خەونمدا)، فەرمووی: ئەی موحەممەد! گوتم: لە خزمەتتدام ئەی پەروەردگارم، بۆ هەر شتێك كە تۆ ڕازی بكات، فەرمووی: ئایا دەزانی فریشتەكانی سەرێ لە چیدا مشتومڕیانە؟ گوتم: پەروەردگارم نازانم، ئنجا دەستی لەنێو هەردوو شانەكانم دانا، ساردایی‌و فێنكایی دەستیم لەنێوان هەردوو مەمكم (واتە: سینگم)دا هەست پێكرد، پاشان فەرمووی: ئەی موحەممەد! گوتم: لە خزمەتتدام ئەی پەروەردگارم بۆ هەر شتێك كە تۆ ڕازی بكات، فەرمووی: ئایا دەزانی فریشتەكانی سەرێ لە چیدا مشتومڕیانە؟ گوتم: دەربارەی پلەكان‌و كەففارەتەكان (واتە: ئەوشتانەی كە دەبنە هۆی سڕانەوەی گوناهەكان)،

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٤٨٤)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيد برقم: (٦٨٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٢٣٤) وَقَالَ حَسَنٌ غَرِيب، وَصَحَّحَهُ الألباني.

وه دەربارەی پێ هەڵهێنانەکان بەرەو نوێژەکانی بە کۆمەڵ، وه دەستنوێژگرتنی تێرو تەواو لە سەغڵەتییەکان دا، وه چاوەڕێکردنی نوێژ لە دوای نوێژ (بۆ کەسێك کە لە مزگەوت دەمێنی لە ئیعتیکافدا)، وه هەر کەسێك پارێزگاریی لە نوێژەکانی بکات، بە خێر تەمەنەکەی بەڕێ دەکات، وه بە خێر دەمرێ، وه لە گوناهەکانی دەربازی دەبێ، وەك ئەو ڕۆژەی کە لە دایکی بووه.

**دووەم** : ﴿عَنْ مُعَاذ بن جَبَلٍ رضي الله عنه قَالَ: أَبْطَأَ عَلَيْنَا النَّبِي صلى الله عليه وسلم لصَلاة الفَجْرِ حَتَّى كَادَت أن تُدْرِكَنا الشَّمْسُ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلّى بنا فَخَفَّفَ فِي صَلاتِه، ثُمَّ انْصَرَفَ وَأَقْبَلَ عَلَيْنَا بوَجهِه، فَقَالَ: عَلَى مَكَانِكُم! أُخبركم ما بَطَّأني عَنْكُم اليَوْمَ فِي هَذِهِ الصَّلاَة، إني صَلَّيْتُ فِي لَيلَتِي هَذِهِ مَا شَاءَ الله، ثُمَّ مَلَكَني عَيني فَنُمْتُ، فَرَأَيْتُ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ وَأَجْمَلِها، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! فَقُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَبِّ، قَالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: لا أَدْرِي فَوَضَع كَفَّه بَيْنَ كَتِفَيَّ فَوَجَدْتُ بَرد أَنَامله بَيْنَ ثَديَيَّ، فَعَلِمْتُ مِنْ كُل شَيءٍ وَبَصَرْتُه، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّد! قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَبِّ! قَالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: فِي الكَفَّارَاتِ قَالَ: وَمَا هُنَّ؟ قُلْتُ: المَشْيُ عَلَى الأَقْدَامِ إِلَى الْجماعَات، وإِسْبَاغُ الْوُضُوءِ فِي السبرات، قُلْتُ: والدَّرَجَات، قَالَ: وَمَا هُوَ؟ قُلْتُ: إِطْعَامُ الطَّعَامِ ولَين الكَلاَم والصَّلاَة باللَّيلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ، قَالَ: سَل، قُلْتُ: اللَّهُمَّ إِنّي أَسْأَلُكَ الحسَنَات وَتَرْكَ الْمُنْكَرَات، وَحُبَّ الْمَسَاكِينِ، وَأَنْ تَغْفِرَ لِي وَتَرْحَمَنِي، وَإِذَا أَرَدْتَ فِتْنَة بَيْنَ خَلْقِكَ فَنَجّني إِلَيْكَ غَير مَفْتُون، وَأَسْأَلُكَ حُبَّكَ، وَحُبَّ مَنْ يُحِبُّكَ، وَحُبّ عَمَلٍ يُقَرّبني إلى حُبّك﴾[1]، واتە: موعازی کوڕی جەبەل خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بۆ نوێژی

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٢١٦٢) تعليق شعيب الأرنؤوط : ضعيف لاضطرابه، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (٢٩٠)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٩١٣).

بەیانی درەنگ هات، نزیك بوو خۆر هەڵبێ، دوایی هاتە دەر نوێژی پێکردین، وە نوێژەکەی بە سووکیی کرد، پاشان لە نوێژەکەی تەواو بوو، ڕووی تێکردین فەرمووی: لە شوێنی خۆتان بن! هەواڵتان پێدەدەم کە بۆچی ئەمڕۆ درەنگ هاتم، ئنجا فەرمووی: ئەم شەو ئەوەندەی کە خوا بیەوێ نوێژم کرد، دوایی خەو زۆری بۆ هێنام‌و چاوەکانم خەوتن، پەروەردگاری زاڵ‌و پایە بەرزم لە جوانترین‌و ڕێکوپێکترین شێوەدا بینی، فەرمووی: ئەی موحەممەد!

گوتم: لە خزمەتدام پەروەردگارم.

فەرمووی: ئایا دەزانی فریشتەکانی سەرێ لە چیدا مشتومڕیانە؟

گوتم: نازانم.

لەپە دەستی خستە نێوان هەردوو شانەکانم، هەستم بە ساردایی سەرە پەنجەکانی کرد لە نێوان هەردوو مەمکم دا، (واتە: لەسەر سینگم)، وە هەموو شتێکم زانی‌و بینی، دوایی فەرمووی: ئەی موحەممەد!

گوتم: لە خزمەتتدام پەروەردگارم.

فەرمووی: ئایا دەزانی فریشتەکانی سەرێ لە چیدا مشتومڕیانە؟

گوتم: دەربارەی کەففاڕات.

فەرمووی: کەففاڕات چین؟

گوتم: ڕۆیشتن بە پێیان بەرەو نوێژی بە کۆمەڵ، وە دەستنوێژی تەواوگرتن لە کاتی بەیانیانی سارددا، گوتم: وە دەربارەی پلەکان.

فەرمووی: پلەکان چین ؟

گوتم: خواردن دان بە خەڵك‌و، قسەی نەرم لەگەڵ خەڵك کردن، وە شەونوێژکردن لە شەودا، لە کاتێکدا کە خەڵك خەوتوون.

ئنجا خوا پێی فەرمووم: داوام لێبکه (واته: لێم بپاڕێوه).

منیش گوتم: خوایه! داوات لێدەکەم: چاکەکانم به نسیب بکەی، وه خراپەکان واز لێبێنم، وه داوات لێدەکەم: خۆشەویستیی هەژارانو نەدارانم بخەیه دڵ، وه داوات لێدەکەم: لێم ببووریو، بەزەییت پێم دابێ، وه ئەگەر ویستت خەڵك تاقی بکەیەوەو تووشی بەڵایەکیان بکەی، بمبەوه بۆ لای خۆت، بێئەوەی من تاقی بکەیەوه، (واته: بێئەوەی تووشی گوناحو تاوان ببم)، وه داوات لێدەکەم: خۆشەویستیی خۆتم بخەیه دڵ، وه خۆشەویستیی هەر کەسێك که تۆی خۆشدەوێ، وه خۆشەویستیی هەر کردەوەیەك، که له خۆشەویستیی تۆم نزیك دەخاتەوه.

سێیەم: ﴿عَنِ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَائِشٍ رضي الله عنه، قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ: رَأَيْتُ رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ ، فَقَالَ : فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ فَقُلْتُ: أَنْتَ أَيْ رَبِّ أَعْلَمُ، فَوَضَعَ كَفَّهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ فَوَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْنَ ثَدْيَيَّ، فَعَلِمْتُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ، ثُمَّ تَلا: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾ الأنعام﴾[1]، واته: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عائیش خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم له پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو، دەیفەرموو: پەروەردگاری خۆمم له جوانترین شێوەدا بینی، فەرمووی: فریشتەکانی سەرێ له چیدا

١) أَخْرَجَهُ الدَّارِمِيُّ برقم: (٢١٤٩)، قَالَ حُسَين سَلِيم أَسد: إِسنادُهُ صَحِيح إِذَا ثَبَتت صُحْبَة عبد الرحمن بن عائش، قال ابن حبان له صحبة، وقال البخاري له حديث واحد إلا أنهم مضطربون فيه، وقال بن السكن يقال له: صحبة، وذكره في الصحابة محمد بن سعد والبخاري وأبو زرعة الدمشقي، وأبو الحسن بن سميع، وأبو القاسم البغوي، وأبو زرعة الحراني وغيرهم، الإصابة في تمييز الصحابة، لابن حجر ج٤، ص٣٢٠ -٣٢٤، رقم الترجمة: (٥١٥٢).

مشتومڕیانه؟ منیش گوتم: تۆ زاناتری ئەی پەروەردگارم ! دەستی خستە نێوان هەردوو شانم، هەستم بە فێنکایی‌و ساردیی کرد لەنێوان هەردوو مەمکم دا (واتە: سەر سینگ)، هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەویدا هەبوو، بۆم دەرکەوت، دوایی (پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾الأنعام، واتە: ئاوا مولّکی فراوانی ئاسمانەکان‌و زەوی پیشانی ئیبراهیم دەدەین، تاکو لە بڕوا پتەوان بێ.

ئنجا جگە لەو سێ هاوەڵە، لە دە (١٠) هاوەڵی دیکەشەوە، ئەم فەرموودەیە بە شێوازی جۆراو جۆر گێڕدراوەتەوە : کە بە پێویستی نازانم ماناکردنەوەی هەموویان دووبارە بکەینەوەو یەکسەر دەقە عەرەبییەکەیان دێنین :

**چوارەم**: ﴿عَنْ أَبِي رَافِع، قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُول الله صلى الله عليه وسلم مشرق اللّون فعرف السرور فِي وَجْهِهِ، فَقَالَ: رَأَيْتُ رَبّي فِي أَحْسَن صُورَة، فَقَالَ لِي: يَا مُحَمَّد! أَتَدْرِي بِمَ يَخْتَصِم الـمَلأ الأَعْلَى؟ ... ﴾{أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي"الكبير" برقم: (٩٣٨)}.

**پێنجەم**: ﴿عن أبي عبيدة الجراح عن النبِّي صلى الله عليه وسلم قال: رَأَيْتُ رَبِّي ﷻ فِي أَحْسَن صُورَة، قال: فيم يَخْتَصِم الـمَلأ الأَعْلَى ...؟﴾ {رواه الطبراني في "الدعاء": ج ١، ص (٤١٩)}.

**شەشەم** : ﴿عن ثوبان، قال: خرج إلينا رسول الله صلى الله عليه وسلم بعد صلاة الصبح، فقال: إن رَبِّي تعالى أتاني الليلة في أحسن صورة...﴾ {رواه الطبراني في"الدعاء": (١/٤١٩)}.

**حەوتـەم** : ﴿عَنْ أَبي أُمَامَةَ الباهلـي، قالَ: قَـالَ رسـول الله صلى الله عليـه وسـلم تَراء لــي رَبِّـي فِـي أَحْسَـن صُورَة، فقـال: يـا محمــد...﴾ {رواه الطَّبَــرَانِيُّ فــي "الدعاء": (١/٩٣٨)}.

**هـەشتـەم** : ﴿عن أبـي هريرة، قال: خَـرَجَ عَلَـيْنَا رَسُول الله صلى الله عليـه وسـلم فقال: رَأَيْـتُ رَبِّـي تبارك وتَعالـى فِي أَحْسَـن صُـورَة...﴾ {أَخْرَجَـهُ الـدَّارَقُطْـنِي فِي كتاب "رؤيــة الله" (١/١٧٨)}..

**نۆيــەم** : ﴿عَنْ عِمْرَان بن حُصَـيْن عَنِ النَّبِـيّ صلى الله عليه وسـلم قَــالَ: أَتَــاني اللَّيلَة رَبّي عَزَّ وَجَلَّ فِي أَحْسَن صــورة...﴾ (أَخْرَجَــهُ الـدَّارَ قُطْنِــي فِـي "رؤيــة الله"، ص ١٨٠).

**دەيــەم** : ﴿عَنِ ابْنِ عُمَـر، قَالَ: قَـالَ رَسُـول الله: أَتَـانِي رَبّـي عَـزَّ وَجَـلَّ فِـي أَحْسَـن صُــورَة...﴾ (أَخْرَجَـهُ الــدَّارَ قُطْـنِي فِي "رؤيـة الله"، ص١٨٠).

**يــازدەيــەم** : ﴿عَــنْ أَنَس بْنِ مَالك قَــالَ أَصــبَحْنَا يَوْمَــاً فَـأَتى رَسُــول الله صلى الله عليه وسلم فَـأَخبرنا، قَالَ أَتَانِي رَبي عَزَّ وَجَلَّ البَارِحَة فِي مَنَامِي فِـي أَحْسَــن صُورَة...﴾ (أَخْرَجَــهُ الـدَّارَقُطْنِي فِــي "رؤية الله" رقم: (٢٧٦)).

**دوازدەيــەم** : ﴿عَنْ أُمّ الطفيل امرأة أُبيَّ بن كَعْب قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُول الله صلى الله عليه وسلم يَقُولُ: رَأَيْـتُ رَبي فِي الـمَنَام ...﴾ (أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ فـي "الكبيـر" برقم: (٣٤٦)).

**سـێزدەيــەم** : ﴿عَـنْ مُعَــاذ بن عَفْرَاء، قَـالَ: قَـالَ رَسُول الله صلى الله عليه وسـلم رَأَيْــتُ رَبِّي فِي حَـظِيــرَة مِـن الفِرْدَوس﴾{كنـز العمال، رقم: (١١٥٤)}.

ئنجـا (إبن تيمية) لە كتێبـی (مجموع الفتـاوی)دا گوتوويەتی: {وَكَذَلِكَ الْحَـدِيثُ الَّـذِي رَوَاهُ أَهْـلُ الْعِلْمِ أَنَّهُ قَـالَ: ﴿ رَأَيْت رَبِّي فِي صُورَةِ كَذَا وَكَـذَا ﴾ يُـرْوَى مِـنْ طَرِيقِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَمِنْ طَرِيقِ أُمِّ الطُّفَيْلِ وَغَيْرِهِمَا وَفِيـهِ ﴿أَنَّهُ وَضَـعَ يَـدَهُ بَـيْنَ كَتِفَـيَّ حَتَّى وَجَدْت بَرْدَ أَنَامله عَلَى صَدْرِي﴾ هَـذَا الْحَـدِيثُ لَـمْ يَكُـنْ لَيْلَـةَ الْمِعْـرَاجِ، فَـإِنَّ هَـذَا الْحَدِيثَ كَانَ بِالْمَدِينَـةِ. وَفِي الْحَدِيـثِ: ﴿أَنَّ النَّبِـيَّ صلى الله عليـه وسـلم نَـامَ عَنْ صَـلَاةِ الصُّبْحِ ثُمَّ خَـرَجَ إلَيْهِمْ وَقَالَ: رَأَيْت كَذَا وَكَـذَا﴾، ... فَعُلِـمَ أَنَّ هَـذَا الْحَدِيثَ كَانَ رُؤْيَـا مَنَامٍ بِالْمَدِينَةِ، كَمَا جَاءَ مُفَسَّـرًا فِي كَثِيـرٍ مِنْ طُـرُقِهِ ﴿إنَّهُ كَـانَ رُؤْيَا مَنَامٍ﴾ مَعَ أَنَّ رُؤْيَا الْأَنْبِيَاءِ وَحْيٌ لَمْ يَكُنْ رُؤْيَا يَقَظَـةٍ لَيْلَةَ الْمِعْـرَاجِ. وَقَـدْ اتَّفَـقَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم لَمَّا يَرَ رَبَّـهُ بِعَيْنَيْـهِ فِـي الْأَرْضِ}[1]، واتـە: هەروەها ئەو فەرموودەيەی كە زانايان گێڕاويانەتەوە كە پێغەمبەر صـلی الله عليە وسلم فەرموويەتی: پەروەردگـاری خۆمم لە شێوەيەكی ئاواو ئاوادا بينی، ئەو فەرموودەيە لەڕێی (ابْنِ عَبَّاس وَأُمِّ الطُّفَيْـلِ)و غـەيری ئەوانيشـەوە، گێڕدراوەتـەوە، وە ئەوەی تێدايە كە: (خوا دەسـتی خسـتە نێـوان شـانەكانم، تـاكو سـاردايی سـەرە پەنجەكانيم لە سـينەمدا هەسـت پێكرد)، وە ئەم فەرموودەيە لە شەوی ميعـڕاج دا نەبووە، بەڵـكو ئـەو ڕووداوە لە مـەدينـــە بووە، نەك مـەككـە، كەواتـە: زانيمان ئەم فەرموودەيە باسی خەونێك دەكات، كە لە خەودا بووە، وە لە مـەدينەش بووە، وەك ڕوونكراوەتەوە لە زۆربەی گێڕانەوەكاندا، كە خەونێك بووە لەكاتی خەوتندا، لەگەڵ ئەوەشدا كە خەونی پێغەمبەرانيش وەحييە، بەڵام خەونێكی كاتی بێـداريی نەبووە، لە شەوی ميعراج دا، وە بێگومـان مسوڵمانان لەسەر ئەوە يەكدەنگن كە، پێغەمبەر صلی الله عليە وسلم بە چاوی خۆی لەسەر زەوی پەروەردگاری نەبينيوە.

---

١) مجمـوع الفتـاوی، ج ٣ ، ص ٣٧٨.

## ٢ / یەكدەنگیی (إجماع)ی زانایانی موعتەبەر لەسەر دیتنی خوا، لە خەون دا:

زۆربەی هەرە زۆری زانایان لەسەر ئەوە ڕێككەوتوون، كە خوای مەزن لە خەوندا دەبینرێ، ئەگەر نەڵێم هەموویان، چونكە هەندێك لە زانایان دەڵێن: هەموو زاناو پێشەوایان یەكدەنگن، بۆ نموونە:

أ/ (النووي) لە كتێبی (شرح صحيح مسلم)دا دەڵێ: (قَالَ القَاضِي وَاتَّفَقَ العُلَمَاءُ عَلَى جَوَاز رُؤيَةِ اللهِ تَعَالى فِي المَنَامِ وَصِحَّتِها ، وَإِنْ رآه الإِنْسَان عَلَى صِفَة لا تَلِيق بِحَالِهِ مِنْ صِفَات الأَجْسَامِ ، لأَنَّ ذَلِكَ المرئي غَير ذَاتِ اللهِ تَعَالَى، إِذْ لا يَجُوز عَلَيْهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى التَّجَسُّم ولا اخْتِلاَف الأَحْوَالِ بِخِلاَف رُؤْيَةِ النَّبِي صلى الله عليه وسلم)[١]، واتە: قاضی عیاض گوتوویەتی: زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، كە دەگونجێ خوای بەرز لە خەوندا ببینرێ، وە ڕاستە كە ببینرێ، با ئینسان بە شێوەیەكو لەسەر سیفەتێكیش بیبینێ كە سیفەتی جەستان بێو شایستەی خوا نەبێ، {بۆ وێنە: لە شێوەی بەشەردا ببینێ، یان لە شێوەی ڕووناكییدا بیبینێ}، چونكە ئا ئەو بینراوە، بریتی نیە لە خودی خوای بەرز، {بەڵام خوای بێوێنە، لە وێنەی شتێك دا خۆی دەخاتە بەرچاو}، چونكە ناگونجێ خوا ﷻ بجەستێ، وە ناشگونجێ لە شێوەی جۆراوجۆردا ببینرێ، (وەك خودی بێوێنەی خۆی) بە پێچەوانەی پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم {كە لە شێوەی جۆراو جۆردا دەبینرێ، كورد لە

---

١) ج ١٥، ص ٢٥.

بەرگی کوردیدا دەیبینیٚ، عەرەب لە بەرگی عەرەبی دا، هیندییەك لە بەرگی هیندییداو ...هتد، وە هەر کەسەش بە زمانی خۆی دەیدوێنیٚ}[1].

ئنجا ئەو دەقەی هێنامان لە (قاضي عیاض)ەوە، وێڕای ئەوە کە (النووي) هێناویەتی، هەر کام لە (إبن حجر العسقلاني) خاوەنی (فتح الباري)[2]، وە (إبن الحاج) لە (المدخل)[3]یش دا، هێناویانە.

ب - (الدَّارِمِي) لە (السنن)ی خۆی لەژێر ناوونیشانی: (باب رؤية الرّب في النوم) {باسی بینینی پەروەردگاری بەرز لە خەوندا} دەڵێ: {أَخْبَرَنَا نُعَيْمُ بْنُ حَمَّادٍ عَنْ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ عَبْدِالرَّحْمَنِ عَنْ قُطْبَةَ عَنْ يُوسُفَ عَنْ ابْنِ سِيرِينَ قَالَ: مَنْ رَأَى رَبَّهُ فِي الْمَنَامِ، دَخَلَ الْجَنَّةَ} {أَخْرَجَهُ الدَّارَمِيُّ برقم: (٢١٥٠)[4]}[5]، واتە: نوعەیمی کوڕی حەمماد لە (عبدالحميد) کوڕی (عبدالرحمن) لە (قطبة)وە ئەویش لە یوسفەوە، هەواڵی پێداین کە ئیبنو سیرین (کە یەکێکە لە زانایانی تابیعیینو کتێبی تەعبیری خەونانیشی هەیە) گوتوویەتی: هەرکەسێك پەروەردگاری خۆی لەخەوندا ببینیٚ، دەچێتە بەهەشت.

١) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

٢) فتح الباري، ج ١٢، ص ٣٧٨.

٣) المدخل، ص ٢٩٠.

٤) ج ٢، ص ١٧٠.

٥) نعيم بن حماد: صدوق كثير، الخطأ والوهم، ويوسف: هو يوسف بن ميمون القرشي المخزومي: قال المزي: قال أبو طالب، عن أحمد بن حنبل: يوسف الصباغ مولى آل عمرو بن حريث ضعيف، ليس بشيء، وقال أبو زرعة: واهي الحديث، وقال أبو حاتم: ليس بالقوي، منكر الحديث جداً، ضعيف، وقال البخاري: منكر الحديث جداً، وقال النسائي: ليس بالقوي، وقال في موضع آخر: ليس بثقة، وقال الدار قطني: ضعيف.

ج - یەكێكی دیكە لەو زانایانە كە باسی بینینی خوا دەكات (إبن تیمیة الحراني)یە ڕەحمەتی خوا لە هەموو زانایانی ئیسلام بێ، لە كتێبی (منهاج السنّة النبوية)دا دەڵێ: {ومما يشبه المثال العلمي: رؤية الرَبّ تَعَالى فِي المَنَام فَإِنَّهُ يُرَى فِي صُور مُخْتَلِفَة، يراه كُل عَبْدٍ عَلَى حَسَب إِيمَانه، وَلَمَّا كَانَ النَّبِي صلى الله عليه وسلم أَعْظَم إِيْمَانَاً مِن غَيرِه، رَآهُ فِي أَحْسَن صُورَة، وَهِيَ رُؤْيَة مَنَام بالمَدِينَة كَمَا نطقت بذلِكَ الأَحَادِيث المَأثورة}(۱)، واتە: وە لەوەی كە وەك وێنەی زانستیی دەچێت، بینینی خوای بەرزە لە خەوندا، خوای بەرز لە شێوەی جیاجیادا دەبینرێ، هەر بەندەیەك بە پێی ئیمانی خۆی خوا دەبینێ، ئنجا لەبەرئەوەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئیمانی لە هی هەموو كەس مەزنترو تەواوتر بووە، بۆیە خوای بەرزو مەزنی لە جوانترین شێوەدا بینی، كە ئەویش خەونێك بوو لە مەدینە بینی، وەك لە فەرموودە گێڕراوەكان دا هاتوە.

هەڵبەتە مەبەستی (إبن تیمیة)دا لەوەدا كە دەڵێ: خەونێك بووە لە مەدینە بینیویەتی، ئەوەیە كە وانەزانرێ، ئەو دیتنەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆ خوا مەبەست پێی: شەوی شەوڕۆو بەرزبوونەوە (ليلة الإسراء والمعراج) بووە.

هەروەها هەر (إبن تيمية الحراني) لە (مجموع الفتاوى)دا گوتوویەتی: {وَقَدْ يَرَى الْمُؤْمِنُ رَبَّهُ فِي الْمَنَامِ فِي صُوَرٍ مُتَنَوِّعَةٍ عَلَى قَدْرِ إيمَانِهِ وَيَقِينِهِ}(۲)، واتە: وە ئیماندار جاری وا هەیە پەروەردگاری خۆی لە خەوندا دەبینێ، لە شێوەی جۆراو جۆردا، بەپێی ئیمانەكەی و یەقینەكەی.

۱) ج ٥، ص ٣٨٣.

۲) ج ٣، ص٣٩٠.

## ٣/ نـاوی ژمـارەیـەك لە زانـاو پێشـەوایان ـ وەك نموونـە ـ کـە خـوای بـەرزو مـەزنیـان لە خـەون دا، دیـوە:

دیـاره من ناوی هــەژده (١٨) کەسم هێنــاوه لـەو کتێبــه هـەر ئەوەنـدەیـــانم لـێ وەرگرتـوە، ئەگەرنا بۆخۆی نـاوی زۆر زیـاتری هێنـاوه[١]:

١ - (حسن بـن علـي بـن أبـي طالـب) وەك (الصّالحي) لـه کتێبــی (سـبل الهـدى والرشـــاد) بەرگــی (١١)، لاپـــەڕە (٢٨٤)دا هێنـاویەتـــی، کـه خــوای بـەرزو مەزنـی له خـەون دا بینیـوە.

٢ - (الحسن البصري) وەك له (إبن الجَزَري) له کتێبـی (الزهـر الفـاتح) بـەرگی (١) لاپـــەڕە (١١)دا هێنـــاویـــەتی.

٣ - (رقبــة بـن مصـقلة) وەك (الطبـــراني) لـه (الــمعجم الأوسـط) بـەرگی (٣)، لاپەڕە (٣٧٩)، وە (إبن الجعـد) له (مسند) له بەرگی (١)، لاپـەڕە (١٩٨)، وە (البيهقي) له (شعب الإيـمان) بەرگی (٣)، لاپەڕە (١٦٤)، وە (إبـن حبـان) لـه کتێبـی (الثقـات) بەرگـــی (٤) لاپـەڕە (٣٠١)، وە (إبـن الجـوزي) لـه کتـێبی (الـمنتـظم) بەرگی (٨) لاپەڕە (٤٢) دا، ئەو بەسـەرهـاتەیان هێنــاوە.

٤ - (علـي بـن الـــموفق) (البيهقـــي) لـه (شـعب الإيــمان) بـەرگی (٣)، لاپـەڕە (٥٠١)، وە (الغزالـي) له (إحياء علوم الدين) بـەرگی (١) لاپـەڕە (٢٤١)، وە (إبن الـمفلح) له (الـمقصد الأرشد فـي ذکر أصحاب أحمـد)دا باسـی ئەوەیـــان

١) باسـی زیاتر لە حەفتـا (٧٠) کەسـی کـردوە، بڕوانــە: (تعطيـر الأنـام بذکـر مـن رأى ربَّـهُ فِـي الـمَنام) ص: ٦١ ــ ٩٧.

کردوه که (علي بن الـموفق) خۆی باسی کردوەو گوتوویەتی: من له خەونـدا بـه خزمـەت پەروەردگـارم گەیشـتووم.

٥ - (إبراهیم بن أدهم) وەك (إبن الجوزي) له کتێبی (صـفة الصـفوة) بـەرگی (٢) لاپەڕە (٣٤٢)، وە (أبو طالب الـمکي) له کتێبی (قـوت القلـوب) بـەرگی (٢) لاپـەڕە (١٠٨٢)، وە (التـرمذي) لـه (نـوادر الأصـول) بـەرگی (١) لاپـەڕە (٣٩١)، وە (الصفوري) (نزهة الـمجاس) بەرگی (١) لاپەڕە (٧١)دا هێناویانه.

٦ - (الإمام أبو حنیفة) وەك (حاشـیة البجیرمـي علـی الخطیـب) لـه بـەرگی (١) لاپەڕە (٤٣١)دا، هـەروەهـا (شرح الحَصکفي) لـه بـەرگی (١) لاپـەڕە (٥١)دا، وە (شـذرات الذهب) لـه بـەرگی (٣) لاپـەڕە (٢٥)، هـەر کـام لـەو سیـّیانەش خـەون دیتنـی ئەبو حەنیفـەیان به خـوای بەرزەوە نەقـڵ کـردوە، تەنانـەت لـه هەندێکیان دا هـاتوه کـه (أبـو حنیفـة) گوتوویـەتی: سـەد (١٠٠) جـار لـه خـەونـم دا به خزمـەت خوای پەروەردگار گەیشـتووم.

٧ - (الإمام الشافعي)، کـه (عبدالـمجید العـدوي) لـه لاپـەڕە (١٥٨)ی کتـێبی (التحفة الـمرضـیة)دا هێنـاویتـی، کـه خوای بـێهـاوەڵـی له خەون دا دیوەو له کێشەیەکی گەورەی (هارون الرشید) دەربازی بـووە.

٨ - (أبو یزید البسطامـي)، کـه (إبن الجـوزي) له کتێبـی (صـفة الصـفوة) بـەرگی (٢) لاپـەڕە (٣١١)دا، وە (إبن تیـمیة) له (مجموع الفتاوی) بەرگی (٢) لاپـەڕە (٣١٥)دا، وە (إبن القیـم) له (مدارج السـالـکین) بەرگی (٢) لاپەڕە (٣)دا، وە (طبقـات الـمناوي الکـبری) لـه بـەرگی (١) لاپـەڕە (٤٥٢)دا، هـەروەها (الشـاطبـي) له (الإعـتصـام) بەرگی (٢) لاپـەڕە (٢٦٠)دا، باسـیان کـردوه کـه (أبو یزید البسطامي) له خەونی دا به خـزمـەت خوای پەروەردگار گەیشـتوه.

٩ - (الإمام الأوزاعي) هـەر یەك لـە (الأصـفهانـي) لـە (حلیـة الأولیـاء) بـەرگی (٦) لاپەڕە (١٤٢)دا، وە (إبن الجـوزي) لـە (صـفة الصفوة) بەرگـی (٢) لاپەڕە (٤١٨)دا، وە لە (الـمنتظم) بـەرگی (٨) لاپـەڕە (١٩٨)دا، وە (تـأریخ دیمشـق) بەرگی (٢) لاپەڕە (٤١٨)دا، وە (إبن كثیـر) لـە (البدایـة والنهـایة) بەرگـی (١٠) لاپـەڕە (١١٧)دا، باسـی خـەونی ئەو پێشـەوایەیـان كـردوە، بـە خـوای پەروەردگـارەوە.

١٠- (الإمام أحمد بن حنبل) (الخلّال) لە كتێبـی (الـمجالس العشرة) بـەرگی (١) لاپەڕە (٤٥)دا، وە (الدمیري) لە (حیاة الحیوان) بەرگی (١) لاپـەڕە (٥١)دا، وە (الذهبـي) لە (السِّیَر) بەرگی (١١) لاپەڕە (٣٤٧)، وە (الغـزالي) لە (الإحیاء) بەرگی (١) لاپەڕە (٢٤٧)دا، باسـی لـە خەونـدا بینـینی خـوای پـەروەردگاریان كردوە، لەلایەن ئیمام ئەحمەدەوە.

١١- (الحكیم التـرمذي) كــە یەكـێك لـە فەرموودەناسـانە، جیـا لـە (الترمـذي) خـاوەنی (السنن)، كە (حاشیة البجیـرمي علی الخطیب) لە بـەرگی (١) لاپـەڕە (٤٣١)دا، وە هـەروەها لـە كتێبـی (بریقـة محمودیـة) لـە بـەرگی (١) لاپـەڕە (١٦٥)دا، وە (طبقات الـمناوي الكبـری) لە بـەرگی (١) لاپـەڕە (٥٨٩)دا، وە (الدمیاطي) لە كتێبـی (إعـانة الطالبین) بـەرگی (١) لاپـەڕە (٢٤٧)دا، باسـی ئەوەیان كردوە كە (الحكیم التـرمذي) گوتوویـەتی: زۆرجـاران لـە خـەون دا بـە خزمـەت خـوا ﷻ گەیشـتووم.

١٢- (علي بن الخطاب الجزیري) كـە هەر یەك لە (الـمناوي) لە (طبقـات الـمناوي الكبـری) لە بەرگی (١) لاپەڕە (٦٣٢)دا، وە (الشـعراني) لـە (لطـائف الـمنن للشعراني) لە لاپەڕە (٧١٨)دا هێناویانە، كە خەونی بە خوای تاكەوە بینیـوە.

١٣- (علي بن وهب السنجاري) وەك (المناوي) لە (طبقات المناوي الكبرى) لە بەرگی (١) لاپەڕە (٦٩١)دا باسی کردوە، کە خەونی بە خواوە بینیوە.

١٤- (أبو إسحاق الإسفرائيني) وەك (إبن العربي) لە کتێبی (عارضة الأحوذي) لە بەرگی (١٢) لاپەڕە (١١٧)دا هێناویەتی، کە خەونی بە پەروەردگاریەوە بینیوە.

١٥- (الإمام أحمد الرفاعي) وەك (الشعراني) لە کتێبی (الطبقات الكبرى للشعراني) بەرگی (١) لاپەڕە (٢٨٩)دا هێناویەتی، کە لە خەونی دا بە خزمەت خوای بەرزو مەزن گەیشتوە.

١٦- (عبدالوهاب الشعراني) وەك لە کتێبی (لطائف المنن) بەرگی (١) لاپەڕە (٢٨٩)دا گوتوویەتی: دوو جاران لە خەون دا شەڕەفی دیتنی خوای بەرزو مەزنم پێبرا.

١٧- (الآلوسي صاحب التفسير) وەك لە تەفسیرەکەی خۆی (روح المعاني) لە بەرگی (٩)، لاپەڕە (٥٢)دا، باسی کردوە، کە خوای پەروەردگاری لە خەون دا بینیوە.

١٨- (الملا رمضان البوطي) بابی دکتۆر (محمد سعيد رمضان البوطي)یە، کە کوردەو خەڵکی بۆتانەو بەداخەوە لە هەلومەرجێکی ناخۆش دا لە سوریا کوژرا، دیارە نووسەری ئەو کتێبە کە من ئەو شتانەم لێ خواستۆتەوە دەڵێ: لە ساڵی (١٤٢٥)ی کۆچیی دا، لەگەڵ (توفيق)ی نەوەی دا، کە کوڕی دکتۆر (محمد سعيد رمضان البوطي)یە، پێکەوە بووین لە سەفەری حەج دا، لە (منی) ئەو خەونەی باپیری بۆ گێڕامەوە، کە لە نەخۆشیی مەرگی دا، لە خەونی دا، قیامەت هاتوەو، خوای بێ هاوەڵی بینیوە .

١٩- كۆتـا كەس خۆمم كە باسـم كـردوە، دیـارە مـن نزیكـەی حەفتەیـەك پـێش گیـرانم لەلایـەن ئەمریكییەكـانەوە، لـە (٢٠٠٣/٧/١٠) دا لـە خـەون دا بەخزمەت خـوای پەروەردگـار گەیشـتم، كە ئەمـەش دەقـی ئەو خەونـەیە:

لە خەونم دا بینیـم خـوای بەرزو مـەزن لە ئاسمانێ هـاتە خـوارو، منـی لەگەڵ خـۆی دا بردو بە پێنـج شـوێن دا ــ كە لە شـێوەی ژوور دابـوون ــ گیـرامـی، لـە هـەر ژوورەدا ماوەیـەكـی كەم دەمـامەوە، پاشـان كـە لـە ژووری پێنجـەم تـەواو بوویـن، هەسـتم كـرد خـوای بەخشـەرو بەخشـندە لەگـەڵ خـۆی هێنـامیـەدەر، یەكسـەریش دوای ئـەوە بێـداربوومـەوە.

بەڵام ئەوەی بۆ مـن جێـی سـەرنج بوو ئەوەبوو، كە لە كـاتی گـەڕانـم بـە نێـو ژوورەكان دا، هەستم بە ناڕەحەتیـیو دڵتـەنگیی دەكـرد !

شـایانـی باسیشـە: ئەم خـەونـەم دواتـر لە سـەدا سـەد (١٠٠/١٠٠) هـاتەدی، چونكـە لـە مـاوەی گیـرانی بیسـتو دوو مانگـە (٦٥٩) ڕۆژەدا، لـە لایـەن ئەمریـكاوە، پێنج شـوێنیـان پێكـردمو، هـەر كاتێـك دەیـانبـردم بۆ هـەر كـام لـە ژوورەكانو سـەرنجم دەدایـە: ئەو ژوورانـەم دەهاتنـەوە بەرچـاو، كە لە خەونەكەم دا پێیـان دا گـەڕابوومو، هـەر لەو كاتەش دا، لە تەعبیـری خەونـەكەم حاڵـی بـوومو، زانیـم كـە ئـەو دڵتـەنگییـەم یانـی چـی ؟ وە لـەوەش حاڵـی بـووم كـە دەربازكرانیشـم هـەر لە لایەن خـوای میـهرەبانەوە بـوو، چ لە خـەونەكەم داو چ لـە حاڵـەتی واقیـعی دوای خەونەكەشم دا.

چونكـە بێـگومـان هۆكارەكانیش هـەر بەشـێكن لـە قـەدەری خـواو، لـە ژێـر ڕكێفـی ویسـتی ڕەهـاو حەكیـمانەی خـوادا كـاردەكـەن !

هەروەها ئێستاش پاش چاپ[1] و بڵاوكرانەوەی ـ كتێبی یان ڕاستتر بڵێم: مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلىَّ في كتاب الله عز وجل) ـ كە هیوادارم كەڵێنێكی باش بگرێ‌و، خوا هێزوپێزێكی زۆری تێبخات، زیاتر لە حیكمەتی ئەو ماوە مانەوەیەم لە زینداندا، تێگەیشتووم، چونكە هەفتەیەك بەر لە ڕزگاربوونم، لە پاكنووس كردنی ئەو كتێبەم بوومەوە !

دیارە لە چاوپێكەوتنێكیش دا كە لەگەڵم كرا، وە دەربارەی بەندكرانم بە ناوی: (ئەشكەنجەو زیندان) كە ئێستا وەك كتێب، چاپكراوە[2]، باسی ئەو خەونەم كردوە، ئنجا لەوبارەوە هەندێ خەڵك ڕەخنەو تێبینی یان هەبوو كە گوایە من قسەیەكی ناشەرعییم كردوەو قسەیەكی ناهەقم كردوە ! بەڵام لە ڕاستییدا وانیە، ئەوەتا ئەو هەموو زانایانەی باسم كردوون، كە هی وایان هەبووە گوتوویەتی: دووجارو سێ جارو، تەنانەت هی وایان هەیە گوتوویەتی: سەد (١٠٠) جار بە خزمەت خوای پەروەردگار گەیشتووم لە خەون دا !

لە كۆتاییش دا دەڵێم :

هەركام لە (ابن سيرين) لە (مُنْتَخَب الكلام في تفسير الأحلام)، وە (عبدالغني النابلسي) لە (تعطير الأنام بذكر من رأى ربَّـهُ فِي المَنام)، وە (ابن شاهين) لە (الإرشادات في علم العبادات)دا لە سەرەتای كتێبەكانیانەوە كە هەر سێكیان سەرچاوەی موعتەبەرن بۆ مانا لێكدانەوەی خەونان، لە پیتی هەمزە (أ) دا باسی خەون بینین بە خوای بەرزو مەزن‌و چۆنیەتی تەعبیركردنەوەیان كردوە.

---

١) ئەو كتێبەم لە چاپی یەكەمی دا، بە هەشت بەرگ‌و، لە دەوری (٣٥٠٠) لاپەڕەدا، چاپ‌و بڵاوكرایەوە، لە ساڵی (٢٠١٤) دا.

٢) هەروەها بە هەردووك زمانی: عەرەبیی‌و فارسییش، چاپ و بڵاوكراوەتەوە.

# نێوەڕۆك

ئەم بەرهەمەی بەردەستت بابەتێکی زۆر گرنگ و هەستیار دەتوێژێتەوە، کە بریتیە لە: [ بینینی خوای بەرزو مەزن لە دنیاو دوارۆژدا]، کە هەر لە دێر زەمانەوە ئەو بابەتە مشت و مڕێکی زۆری لەسەر بووە، لەنێو زانایانی ئیسلام دا.

شایانی باسیشە ئەم باسە یەکێکە لە باسەکانی سوورەتی (الأنعام) کە بەرگی پێنجەمی: [ تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز] پێک دێنێ، بەڵام بە باشم زانی بەشێوەی بەرهەمێکی سەربەخۆش چاپ و بڵاو بکرێتەوە، تاکو ئاسانتر بکاتە دەستی خوێنەرانی خۆشەویست، چونکە هەموو کەس ئەو تەفسیرەی بۆ مەیسەر نابێ.

هیواداریشم ئەم لێکۆڵینەوەیە مایەی زیاتر بەرچاو ڕوونبونەوەی خوێنەران بێ لە بواری خواناسین داو، سەرەنجام هۆکاری زیاتر پتەوبوون و قووڵتربوونەوەی ئیمانیان بێ.

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پاڵاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice
COVER DESIGN
1750 دینار